# یادی کەلار

## بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی بە قەزابوونی کەلار

## ستافی ئامادەکار

شەهاب حاجی ئەحمەد

ساڵەح هەلاج

پ.ی.د.دارا حەمید

مستەفا سەعید

بێستون ژاڵەیی

ئەحمەد محەمەد قادر

دیار ڕەشید

دلێر عەبدولڕەحمان

مەریوان حەسەن

پشکۆ محەمەد

دیزاین: ئامانج عەلی

تیراژ (٥٠٠) دانە

ناونیشان : کوردستان ـ گەرمیان ـ کەلار ـ قایمقامیەتی قەزای کەلار

# لەم ژمارەیەدا ...

# ناوی کەلار لە چییەوە هاتووە؟

## مستەفا سەعید

چەندیـن ڕاوبۆچوونـی جیـاواز هەیـە لەسـەر نـاوی کـەلار، مامۆسـتا جەمـال بابـان لـە کتێبەکەیـدا (اصـول اسـماو المـدن والمواقـع العراقیـە) بەرگـی یەکـەم، بەغـداد ١٩٨٩، ل ٢٥٦ دا دەڵێـت :

١ـ ناوی کەلار لە (کەلا ـ ڕێ) وە هاتوە کە مانای گوندێکی دوور لە ڕێگای گشتی یان چەپەڕێ دەگەیەنێت.

٢ـ پێی وایە کەلار لە (کەڵ ـ یار) ەوە هاتوە، وەك دەزانرێت ئەم ناوچەیە لە مێژەوە ئاسکی زۆربوە.

٣ـ لەبۆچونێکـی تـردا مامۆسـتا جەمـال بابـان پێـی وایـە نـاوی کـەلار لـە وشـەی (کـەڵات) کـە مانـای پەرژیـن یـان قـەڵا یـان شـورە دەگەیەنێـت هاتبێـت ئەمـەش ڕەنگـە لەنـاوی قـەڵای شـێروانەوە وەری گرتبێـت.

٤ـ مامۆسـتا جەمـال بابـان ڕای چوارەمـی دەڵێـت وشـەی کـەلار لەزمانـی عەرەبیـدا بەمانـای (کـەلاوە) یـان وێرانـە دێـت، ئەمـەش ئاماژەیـە بـۆ کاولبـونو وێـران بونـی ئـەم ناوچەیـە چەندجارێـك لەچەنـد سـەردەمێکی جیاجیـادا. (سـەبارەت بەمانـای ئـەم وشـەیە لەزمانـی عەرەبیـدا زۆر گـەڕام لـە فەرهەنگـە عەرەبییەکانـی (المنجـدو القامـوس المحیـگ) ی فەیـروز ئابـادیو (لسـان العـرب، ابـن المنقـور) وشـەیەکم تیایانـدا نەدۆزیـەوە بەنـاوی کـەلار).

شـێخ محەمـەدی خـاڵ لـە ل ١٣٧، بەرگـی سـێیەمی فەرهەنگـی خاڵـدا دەڵێـت (کـەلار) چەنـد شیشـە توتنێکـی زۆرە، کـە وەك خەرمـان لەسـەر یـەك دانرابـێ، نـاوی دێیەکـە لەناوچـەی کفـری.

(کەلارە) دەفرێکی قوڵە لە شیاکە دروست ئەکرێ پوشو پەڵاشی ناوماڵی تێدەکرێ.

هەژار موکریانی لە ل ٦٦٢ ی هەنبانە بۆرینە وا باسی وشەی کەلار دەکات :

کەلار : لەسەر یەك، دانراوی بڵندەوە بووگ، خاپوور، ناوچەیەکە لە کوردستان.

کەلارە : دەفری لەڕیخی وشکەوەکراو بۆ پشکەڵ تێکردن.

کەلارێ : خاپور، وێران.

لەلوغەتنامـەی (دهنـدا) چەندجارێـك نـاوی کـەلار هاتـوە بـەم شـێوەیە، بـەڵام لەهیچکامیانـدا مانـای وشـەکەی لێـك نەداوەتـەوە :

کەلار : بەمانای قازو بۆق (قوڕباغە) هێناوێتی.

کەلار : گوندێکی شاخاوییە لەناوچەی سنجیدی شاری هەروئاباد.

کەلار : کۆمەڵگەیەکە لەخۆراسان.

کەلار : شارێك بوە لە کوێستانەکانی تەبەرستان هەڵکەوتە لەنێوان هەرسێ شاری ئامولو رەیو مازندەران.

کەلار : گوندێکە کە فەرسەخو نیوێك لەباشوری پیرشاردایە.

کەلار ئاباد : یەکێکە لە گوندەکانی شاری شەهسوار.

کەلار دەشت : ناوی یەکێك لە ناحیەکانی شاری نەوشەهرە.

کەلار دەشت : ناوی گوندێکی ناحیەی کەلار دەشتی شاری نەوشەهرە.

مامۆستا گیوی موکریانی سەبارەت بەوشەی (کەلارە) دەڵێت :

کـەلارە : قەرتاڵەیەکـە لەڕیـخ دروسـتدەکرێ خشـتوخاڵی نێوماڵـی تێدەکـرێ، کاسـەی شـکاو، دیوارێکـە نـزم لـە تەپاڵـە دروسـتدەکرێ ژنـان نانـی تێـدا دەکـەن.

لەبـارەی وشـەی (کـەلار) ەوە شـەفیق قـەزاز بۆچونێکـی تـری هەیـەو دەڵێـت (kalar in brimmed hat) بـە ئینگلیـزی مانـای (کێڵگـەی دروێنـە) دەدات، بۆیـە ئـەم دەڤـەرەش بەناوچەیەکـی کشـتوکاڵی نـاسراوە، (بـەڵام بەبۆچونـی مـن، ئـەم بۆچونـە لاوازە چونکـە ئاوەدانکردنـەوەی کـەلار بەسـەدان سـاڵ پێـش هاتنـی ئینگلیـزەکان بـووە بـۆ عێـراق ١٩١٧ ڕەنگـە هـەر بەڕێکـەوت لـەڕوی مانـاوە لەیـەك بچـن گومـان نابرێـت پەیوەندییەکـی زانسـتیو مێژوویـی لەنێـوان ڕسـتە ئینگلیزییەکـەو مانـا کوردییەکەیـدا هەبێـت).

نوسـەرو ڕۆژنامەنـوس مامۆسـتا ئیبراهیـم باجـەڵان لەبارەی نـاوی کـەلارەوە دەڵێـت : لـەو سێسـەد سـاڵەی دواییـدا قـەڵای شـێروانە بەهـۆی تێپەڕبونـی سـەدان سـاڵ بەسـەر دروسـتکردنیدا نهۆمـی سـێیەمی ڕوخـاوەو نهۆمـی دووەمیشـی لاربۆتـەوە، جالەنێـو خەڵکـی ناوچەکـەدا بـە (کەڵاتـە لارەوە) نێوبانگـی دەرکـردوە، بۆیـە پێدەچێـت نـاوی کـەلار لـە (کەڵاتـە لارەکـە) وە هاتبێ واتـە (قـەڵای لار) و بەتێپەڕبونـی ڕۆژگار گـۆڕان بەسـەر ئـەم وشـەیەدا هاتبێـت و خەڵکـی وشـەکەیان سـوك کردبێتـەوە بـۆ (کـەلار) لەبـەر سـوکی لەسـەر زمـان.

مامۆسـتا عەبدوڵـڵا حەسـەن قـادر پێـی وایـە وشـەی (کـەلار) لـە وشـەی (کـەلاوە) وە هاتبێـت، چونکـە لەکۆنـدا لەناوچـەی گەرمیـان بـە (کـەلاوە) وتویانـە (کـەلارە).


شاری کەلار لەسەرەتای هەفتاکاندا


شاری کەلار .... فۆتۆ : محمد صالح

# مێژووی کۆنی کەلار لەڕووی بەڵگە شوێنەوارییەکانەوە

## محەمەد عەلی کەریم ـ شوێنەوارناس

بەپشـت بەسـتن بـە بەڵگـە شـوێنەوارییەکان، بەشـێوەیەکی زۆر پوخـت بـاس لـە مێـژووی کۆنـی ئـەو جوگرافیایـە دەکەیـن کـە ئێسـتا پێـی دەوترێـت قـەزای کـەلار، بابەتەکـە ئاماژەیـە بەچەندیـن قۆناغـی جیـاوازی ژیانـی مـرۆڤ لەناوچەکـە لـە چاخەکانـی هـەزارەی شەشـەمی پێـش زایینـەوە تاوەکـو سـەدەکانی حەڤـدە و هەژدەیەمـی زایینـی.

کۆنتریـن مێـژوی دەرکەوتنـی بونـی ژیانـی مـرۆڤ لـە ناوچەکـە، دەگەڕێتـەوە بـۆ هـەزارەی شەشـەمی پێـش زاییـن، دیـارە دەنگونجـێ کۆنـتر لـەم مێـژوەش مـرۆڤ لـەم ناوچەیـەدا ژیابـێ، بـەڵام ئێمـە پشـتمان بەبەڵگـە زانسـتییەکان بەسـتووە کـە ئەوانیـش بەڵگـە شـوێنەوارییەکانە، بەڕێوەبەرایەتـی شـوێنەواری گەرمیـان لـە سـاڵی ٢٠١٢ دا دوای دوو وەرز کاری کنـەو پشـکنین لـە (گـردی ڕەحیـم) لەناحیـەی ڕزگاری چەندیـن پاشـماوەی شـوێنەواری دۆزییـەوە وەکـو گڵێنـەی جۆراوجـۆرو بیناسـازی تایبـەت بـە چاخـی (حەلـەف) جگـە لـە گرنگـی دەرکەوتنـی بیناسـازی تایبـەت بەچاخـی (حەلـەف)، هەروەهـا چەندیـن شـێواز لـە نەخشـی ڕەنگاوڕەنـگ لەسـەر گـۆڕەکان دۆزراونـەوە لەگرنگتریـن ئـەو نەخشـانەش وێنـەی چەنـد مرۆڤێکـە لەسـەر پارچـە گۆزەیـەك کێشراوەتـەوە، مرۆڤـەکان زیاتـر لـە ئافـرەت دەچـن، وێنەکـە دیمەنـی هەڵپەڕکـێ نیشـان دەدات ئەمـەش دۆزینەوەیەکـی گرنگـە سـەبارەت بـە هەڵپەڕکێـی کـوردی، بـەڵام ئەمـە یەکـەم دۆزینـەوە نیـە سـەبارەت بەسـەماو هەڵپەڕکـێ بەڵکـو پێشـتریش لەسـاڵی ١٩٦٠ لەگونـدی (چۆغەمامـی) لـە ناحیـەی (مەندەلـی) چەنـد دیمەنێکـی تـری هەڵپەڕکـێ دۆزراونەتـەوە لەلایـەن هـەردوو شوێنەوارناسـی ئینگلیـزی (دیڤیـد و جـۆن ئەنسـی) ی هاوسـەرییەوە، هەروەهـا لـە ئێـران لەگونـدی (تەپـە سـیالك) جۆرێکیـتر لـە سـەماو هەڵپەڕکـێ لەسـەر گـۆزەکان دۆزراوەتـەوە.

یەکێکیـتر لەگرنگتریـن دۆزینـەوەکان لەبـواری شـوێنەواردا دەرکەوتنـی چەنـد گـۆڕێـك بـوو لـە گەڕەکـی بەردەسـووری خـواروو کـە چەنـد جـۆرێـك لـە گڵێنـەو کانـزاو مـووروی تێـدا دۆزراوەتـەوە کـە مێژوەکانیـان بـۆ چاخـی (جمـد النـصر ٣٠٠٠ ـ ٢٨٠٠) سـاڵ پێـش زاییـن دەگەڕێتـەوە، ئەمـەش قۆناغێکـی گرنگـی مێـژوو دەردەخـات لـەڕووی ئاسـتی پێشـکەوتن لەبـواری پیشـە دەسـتییەکانو تێڕوانینـی مـرۆڤ لـە ژیـانو مـردن.

قۆناغێکـی تـری مێژویـی لـە گـردی شـێروانەوە دەسـتپێدەکات ئەمـەش کنـەو پشـکنینی سـاڵی ١٩٨٨ دەریخسـت کـە چەنـد چینێکـی مێژویـی هەیـە وەك لەچینەکانـی خـوارەوە شـورایەکی بەهێـز دەردەکەوێـت لەگـەڵ چەندیـن بەڵگـەی تـری شـوێنەواری کـە مێژوەکانیـان دەگەڕێتـەوە بۆمـاوەی نێـوان سـەدەکانی (١٨٠٠ ـ ١٦٠٠) پێـش زاییـن، ئەمـەو دەرکەوتنـی گـۆڕێـك لەسـاڵی ٢٠١٢ کـە چەندیـن گـۆزەو کانـزای لەگـەڵ دۆزرایـەوە مێژوەکانیـان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی مێـژوی ئـەو شـورایە.

قۆناغێکـی تـر لـە مێـژوی ناوچەکـە دۆزینـەوەی ئـەو پاشـماوە شـوێنەوارییانە بـوو کـە لـە نمونەیەکـی بچووکـی گردەکـەی ژێـر بـازاڕی سـەنتەری شـار دۆزرانـەوە، پاشـماوەکانیش خـۆی لەچەندیـن جـۆر گڵێنـەو بـەردوو گـۆڕ دەبینییـەوە کـە مێژوەکانیـان دەگەڕێتـەوە بۆمـاوەی نێـوان سـەدەکانی (١٦٠٠ ـ ١٤٠٠) پێـش زاییـن، هەروەهـا لەگونـدی (بەرلـووت) لەیـەك شـوێنەواردا لـە دوو کاتـی جیـاوازدا دوو گـۆڕی ژنو پیاوێـك دۆزرانـەوە، مـردووەکان لەتابوتـی گڵێنـەی شـێوە هێلکەیـی نێژرابـوون لەگـەڵ چەندیـن پاشـماوەی وەك کانـزاو مـووروو مـۆری بەردیـن، کانـزاکان بریتـی بـون لەجـێ ئاوێنـەو کلدانـی ئافرەتـان، هەرچـی مۆرەکانیشـە لەبـەرد دروسـتکراونو چەنـد جۆرێك

لەنەخشــی ئەندازەیــیو ئاژەڵیــان لەســەر هەڵکۆڵــراوە، مێــژوی ئــەم گۆڕانــە دەگەڕێتــەوە بــۆ ســاڵی (١٣٨ پێــش زاییــن بــۆ ٢٢٨ زاییــن)، لەلایەکیــترەوە لەساڵی ٢٠١٥ دا لــە گــردی شــێروانە گۆڕێکــی تــری هاوشــێوە دەرکــەوت کــە چەنــد پارچــە زێڕێکــی شــێوە سینەبەندی لەگــەڵ نێژرابــوو مێژوەکەشــی هاوســەردەمە لەگــەڵ دوو گۆڕەکــەی گونــدی بەرلــووت، لەهەمــان گــردو لەســاڵی ١٩٨٨ لەچینەکانــی ناوەنــد چەندیــن پاشــماوەی شــوێنەواری دۆزرایــەوە لەنموونــەی گــۆزەو کانــزاو دراوو بیناســازی کــە مێژوەکانیــان دەگەڕێتــەوە بــۆ ســەدەکانی نێــوان (٤ ـ ٧) پێــش زاییــن.

لەکۆتایــی ســەدەی حەوتەمــی زاییــن پرۆژەیەکــی گرنگــی ئاودێــری لــە کــەلار دروســتکر، ئەویــش نــاسراوە بــە (جۆگــەی گاوری) ئــەم جۆگەیــە ئاماژەیەکــی گرنگــە لەبــواری پشــت بەســتنی مــرۆڤ بــە کشــتوکاڵەوە جگــە لــەوەش لایەنێکــی دیکــەی بیناســازی نیشــان دەدات بــەوەی توانــراوە لــە ئاســتێکی بــەرزی هونەریــدا ئــەم جۆگەیــە دروســت بکرێــت، پرۆژەکــە لــە گەڕەکــی (حەمــەی کەریــم) ی کۆنــەوە دەســتپێدەکات بەچەنــد قۆناغێــك درێژدەبێتــەوە تاوەکــو گونــدی (بــان ئاســیاو).

ســەبارەت بەســەدەکانی (٧ ـ ١٠) زاییــنی، بەڵگــەی گرنکــی شــوێنەواری دۆزراونەتــەوە گرنگترینیــان ئــەو پاشــماوانەیە لەچینەکانــی ســەرەوەی گــردی شــێروانە دۆزراوەتــەوە، لەســەدەکانی (١٠ ـ ١٥) زاییــنی بەڵگــە شــوێنەوارییەکان زۆر کەمــن، بــەڵام لێــرەوە کۆمەڵــێ بینــای شــوێنەواری کەلەپــوری دەبینرێــت لەکــەلارو دەوروبــەری، کۆنترینیــان قوللەکانــی نێــوان (کــەلار ـ دەربەندیخــان)ە، ئــەم قوللانــە پێکهاتــوون لــەدوو نهــۆم، شــێوەیەکی لولەکییــان هەیــە بۆ چاودێریکردنــی بەشــێك لەســنوری نێــوان (عوســمانی ـ ســەفەوی) لەســەر ڕووبــاری ســیروان دروســتکراوەو ژمارەیــان زۆرەو لەگونــدی بەدەرســووری خــوارووەوە دەســتپێدەکات بەناوەکانــی (قوللــە برنجــی، ڕازیانــە، وەلــی خنــکاو، مــەلا، قوللەســوتاو، ســەید مەحمــود، نحتیــات، جنــە، قــاپ شــکێنە، لــەواوان، بانــی خــان، ڕێویلــە) مێژوەکانیــان بەتــەواوی ڕوون نییــە بــەڵام لەدوایــن نوێژەنکردنــەوە دراوێکــی عوســمانی ســەردەمی (ســوڵتا عەبدولحەمیــدی یەکــەم ١٢٥٥ کۆچــی ـ ١٨٣٩ زاییــنی) دۆزرایــەوە، ئەمــەش ئاماژەیەکــە بۆئــەوەی کــە مێژوەکانیــان لــەو دراوە کۆنــترن، هەروەهــا بینــای باجگــەی پەیکوولــی هەیــە کــە تارادەیــەك نزیکــە لــە دوایــن قوللــە (قوللــە ڕێویلــە) و پێدەچێــت مێژووەکــەی بگەڕێتــەوە بــۆ هەمــان ســەردەم.

لەناوەنــدی قــەزای کــەلارو لــەدەروازەی شــار (قــەڵای شــێروانە) دەبینرێــت کــە یەکێکــە لــە بینــا نــاوازەو گرنگــەکان لەســەر ئاســتی بینــا کەلەپــوریو شــوێنەوارییەکانی کوردســتان، قەڵاکــە پێکهاتــووە لــە دوو نهــۆمو ژێرزەمینێــك بەچەندیــن یەکــەی بیناســازی گرنــگ ڕازاوەتــەوە، لەگــەڵ چەندیــن نەخــشو نیــگاری قەشــەنگ کــە هەنــدێ بەشــی قەڵاکــەی پــێ ڕازێنراوەتــەوە، نەخشــەکانیش بریتیــن لــە دیمەنــی ڕووەکــیو ئاژەڵــیو ئەندازەیــی، مێــژووی قەڵاکــە بەپێــی زۆر کنــەو ســەرچاوەکان دەگەڕێتــەوە بــۆ ســاڵی (١٨٦٦ ـ ١٨٧٤) کەلەســەر دەســتی (محەمــەد پاشــای جــاف) دروســتکراوە.

لــە گونــدی (تــازەدێ) و لەکەنــاری ڕووبــاری ســیروان، کۆشــکێکی ڕێــك ئەنــدازە دەبینرێــت، کۆشــکەکە بریتیــە لــە ســێ بەشــی ســەرەکی، پێکهاتــووە لــە دوو نهــۆمو بەشــی خزمەتگوزاریــش دەکەوێتــە بەرامبەرییــەوە ئــەم دوو بەشــە بەپێــی دوایــن لێکۆڵینــەوە دەردەکەوێــت لەســەر دەســتی (مەحمــود پاشــای کــوڕی محەمــەد پاشــای جــاف) ەوە دروســتکراوە لەنێــوان ســاڵەکانی (١٨٧٤ ـ ١٨٨٢) هەرچــی بەشــەکەی تریشــە پێشــتر لەلایــەن حەمــە پاشــای باوکییــەوە دروســتکراوە.



شوێنەوارەکانی بەرلوت .... فۆتۆ : محمد عەلی



قوڵڵەکان.... فۆتۆ: محمد عەلی



شوێنەوارەکانی بەرلوت.... فۆتۆ : محمد عەلی



کۆشکی محمود پاشای جاف ... فۆتۆ: محمد عەلی



مۆزەخانەی شارستانی گەرمیان: ... فۆتۆ: شوێنەواری گەرمیان



مۆزەخانەی شارستانی گەرمیان: ... فۆتۆ: شوێنەواری گەرمیان



گردی شێروانە... فۆتۆ: شوێنەواری گەرمیان



گردی شێروانە... فۆتۆ: شوێنەواری گەرمیان

# قەڵای شێروانە وەك ناوەندی شانشینێکی دێرین

خالد مەحمود کەریم *

قەڵای شێروانەو هەردوو گردە گڵینەکەی ژێرەوەی، هەر وەك کەلارو دەوروبەری، لە ڕووی کۆنەناسی و لێکۆڵینەوەی مێژووییەوە، هەمیشە کەنارێکی پشتگوێخراو بوون، لەکاتێکدا کە ناوچەکە بەگشتی لەم ڕووەوە شایانی لالێکردنەوەی زیاترە، چونکە وەك دەردەکەوێت، دەوڵەمەندە بەشوێنەواری دێرینی سەردەمە جیاوازەکانی مێژوو.

لە کنەو پشکنینە سەرەتاییەکانی ساڵی (١٩٨٨ز) دا دەرکەوتووە، هەردوو گردی ژێر قەڵای شێروانە شوێنەوارین و شوێنەواری چەند شارستانیەتێکی لێدەرکەوتووە، لەوانە چاخی ئیسلامی (٦٣٧-١٢٥٨ز) و سەردەمانی ساسانی (٢٢٤-٦٥١ز) و ئەشکانی (٢٤٧پ.ز-٢٢٤ز) و کاشی(١٥٩٥-١١٥٧پ.ز)...هتد. لە باران بارین و لافاوەکەی ساڵی (٢٠١٢ز) دا، لە چینەکانی خوارەوەی گردەکە، گۆڕێك و چەند پاشماوەیەکی گڵینەو کانزایی دەرکەوتوون، کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی هەزارەی دووەمی پ.ز.

لە ئێستادا لێکۆڵینەوە نوێیەکان ئەوە دەردەخەن، کە پێدەچێت قەڵای شێروانەو ڕووباری سیروان، کە بەتەنیشتیدا تێدەپەڕێت، هەردووکیان ڕەنگدانەوەو پاشماوەی ناوی شاری سیمورووم-شیمرووم-ی دێرین بن، کە لە سەردەمی پاش ڕووخانی بنەماڵەی سێیەمی ئوور(٢١١٢-٢٠٠٤پ.ز)دا، بووە شانشینێکی وا بەهێزو توانا، کە باڵادەستبووە بەسەر بەشێکی گرنگی ناوچەکەدا، هەر لە سەرپێڵی زەهاو تا دەگاتە دەروپشتی بێتواتە.

کۆنترین ئاماژەش بۆ سیمورووم و قەڵا یا شووراکەی، دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری (٢٧٠٠پ.ز)، کە لە سەربوردی کردارێکی سەربازیدا، کە لە دژی ئەنجامدراوە، هەواڵەکەی لە بەندێکی سۆمەریدا نووسراوەتەوە. لێکۆڵینەوەکان ئەوەش دەردەخەن، کە سیمرووم (هەروەها کارخار) زۆرترین لەشکرکێشیان لێکراوە، چونکە ئەم دوو شارە لەسەر ڕێگای هەر لەشکرێك بوون، کە ویستبێتی لە باشوورەوە بڕوات بۆ باکوور، واتە بۆ کوردستان.

سارگۆنی ئەکەدی (٢٣٣٤-٢٢٧٩پ.ز) پەلاماری سیمورووم-ی داوە، لە سەردەمی دووەم پاشای بنەماڵەی سێیەمی ئوروریشەوە، کە ناوی «شولگی»یە (٢٠٩٤-٢٠٤٧پ.ز)، ئەم ناوچەیە پەلاماردراوە. هەروەها لە نوسینێکی ئەم پادشایەدا هاتووە، شەڕێکی گەورە لەنێوان سیمورووم لەلایەك و سیماشکی و ئامووریيەکان لەلایەکی ترەوە بەرپابووە. ئامانجی شەڕەکە دەستبەسەراگرتنی ناوچەکە بووە، تاکوو شەپۆلێك کۆچهێنی ئاموورى، کە لە بیابانەکانەوە هاتوون لەم ناوچەدا نیشتەجێبکرێت، بەڵام ئیددی(ن)-سین-ی پادشای سیمورووم لە نووسنێکیدا باس لە شکاندنی هەردوو لا دەکات.

سەرچاوەکان :

* شـوێنەواری گەرمیـان: ڕاپۆرتـی دەرکەوتنـی گۆڕێـك و چەنـد پاشـماوەیەك لـە چینەکانـی خـوارەوەی گـردی شـێروانە، (٢٠١٢).

* کـۆزاد محەمـەد ئەحمـەد، کوردسـتانی ناوەڕاسـت لـە نیـوەی یەکەمـی هـەزارەی دووەمـی پ. ز. دا، سـلێمانی (٢٠٠٦)، ل ل ٢٠٤-٢٥٠

* کـۆزاد محەمـەد ئەحمـەد، بایەخـی خانەقیـن و گەرمیـان لەبـەر ڕۆشـنایی سـەرچاوە کۆنەکانـدا، کۆڤـاری لڤیـن، ژمـارە (١)ی سـاڵی ٢٠٠٩، ل ل٧-١٠.

* م. لە بەشی زانستە کۆمەڵایەتییەکان

زانکۆی گەرمیان ـ کۆلیجی پەروەردەی بنەڕەت



قەڵای شێروانە...          فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان







مۆزەخانەی قەڵای شێروانە ... فۆتۆ: شوێنەواری گەرمیان



مۆزەخانەی قەڵای شێروانە ... فۆتۆ: شوێنەواری گەرمیان

# مێژووی پەروەردەو فێربوون لە کەلار

## سەباح عەلی جاف

پـەروەردەو فێربـوون وەك یەكێـك لەكایـە گرنگەكانـی ژیانـی مـرۆڤ هـەر كۆمەڵگـەو میللەتێـك بەپێـی قوناغـی گەشـەی ژیانیـان گرنگیـان پێداوە بەتایبـەت لـەم ڕووەوە لایەنـی مەعریفی و ئاسـتی هۆشـیاری تاكـەكان كاریگەری هەیـە ، كـەلار وەك یەكێك لەشـارە گرنگەكانـی گەرمیـان و كوردسـتان لەئێسـتادا و گوندێكـی ئـاوەدان لەڕابـردوودا هـەر زوو زۆر لایەنـی ژیـان تێیـدا گەشـەی كـردووە كـە یـەك لـەو كایانـە پەروەردەیـە كـە لێـرەدا تیشـك دەخەمـە سـەر لایەنـی مێـژووی و بەشـێوەیەكی بابەتـی و لـە سـۆنگەی مێـژوو بەپێـی بۆچـونو سـەرچاوەكان چەنـد لایەنێـك لـەو ڕووە شـی دەكەینـەوە.

بـەو پێیـەی كـە كـەلار شـارێكی كۆنـە بەپێـی سـەرچاوە مێژوویـی و شـوێنەوارییەكان كـە لـەم دواییـەدا چەندیـن شـوێنەواری سـەردەمەكانی پێـش زاییـن بـە تایبـەت سـەردەمی خوریـەكان و هەروەهـا دۆزینـەوەی ئاوەڕۆیەكـی كـۆن كـە درێژێكـەی دوو كیلۆمەتـرە و لەنێـو بـازاڕی شـاری كەلاریـش چەنـد پارچـە شـوێنەوارێكی كـۆن دۆزرایـەوە كـە بەپێـی پشـكنینە سـەرەتاییەكان بـۆ سـەردەمی پێـش زاییـن دەگەڕێتـەوە كـە بەپێـی زانیارییەكانـی شـوێنەواری گەرمیـان ئـەو پارچـە شـوێنەوارییانە كـە نزیكـەی ٣٠ پارچـە دەبێـت مێژووەكەیـان بـۆ هـەزارەی دووەمـی پێـش زاییـن دەگەڕێتـەوە، ئەمـەش دەیسـەلمێنێت كـە هـەزاران سـاڵە لەكـەلار خەڵـك ژیـاوەو بەپێـی سـەرچاوەكان لـە سـەردەمی خورییەكانـدا نـاوی شـاری (كراخـار) هاتـووە كـە دەكەوێتـە سـەر ڕوبـاری سـیروان و هەندێـك سـەرچاوە بـاس لـەوە دەكـەن كـە ئـەو شـارە هەمـان شـاری كـەلار بێـت كـە لـە هـەزارەی سـێیەمی پێـش زاییـن نـاوی هاتـووەو لێرەشـەوە دەگەینـە ئـەوەی گـەر كـەلار لەسـەردەمی خورییەكانـدا ئـاوەدان بێـت و ئـەو نەتـەوە دێرینـە كوردییـەی لـێ ژیابێـت كەخـاوەن شارسـتانیەت و كلتـوری خۆیـان بوونـە ئـەوا خاوەنـی نوسـین و پاشـماوەی بـە جـێ مـاون لـەو ڕووەوە.

پـاش هاتنـی ئیسـلام و بڵاوبونـەوەی لەناوچەكانـی كوردسـتان و گەشـەكردنی ئـەو ئاینـەو دروسـت بوونـی گونـدو ئاوەدانـی و دروسـت بوونـی مزگـەوت و حوجـرە ئەمـە كاریگـەری لەسـەر ڕەوتـی خوێنـدن و خوێنـدەواری هەبـووە بەتایبـەت لەناوچـەی گەرمیـان و كـەلارو دروسـتكردنی قـەڵای شـێروانە لەلایـەن حەمـە پاشـای جافـەوە لەسـاڵی ١٨٦٦ دروسـت كـراوە (دروسـت كردنـی ئـەم قەڵایـە پێویسـتی بـە لێكۆڵینـەوەی زیاتـر هەیـە) و پـاش نیشـتەجێبونی جـاف لـەم جێگەیـەو گرنگـی دانیـان بەخوێنـدن و خوێندنـدەواری و بەپێـی سـەرچاوەكان تـا سـییەكانی سـەدەی ڕابـردوو لـە كـەلاری كـۆن چەندیـن حوجـرەی فەقێیـان هەبـووە كـە ڕۆڵـی باشـیان گێـڕاوە لەڕۆشـنبیری و خوێنـدەواری تاكەكانـی ئـەو دەمـەی كـەلارداو ئەمـە لەسـەر ژیانـی گشـتیش ڕەنگـی داوەتـەوەو دەكرێـت لێـرەدا بـاس لەچەنـد ناوێـك بكەیـن لەوانـە (مـەلا محیەدینـی كـوڕی مـەلا سـەعیدی زەلزەلـە، مـەلا مسـتەفا، مـەلا ئەحمـەدی دەكـە) و ئەمـەو ئاوەدانـی كـەلار لەسـەردەمی نوێـدا بـۆ پـاش جەنگـی یەكەمـی جیهانـی لەسـاڵی ١٩١٤ دەگەڕێتـەوە كـە وردە وردە ژیـان لەگونـدی كـەلاری كـۆن دەسـتی پـێ كـردووەو وەك وتمـان خوێنـدن و خوێنـدەواری لـەم گونـدەدا سـەرەتا لـە ڕێگـەی مزگـەوت و حوجـرەوە بـووە كـە بەپێـی ووتـەی مـەلا ئەحمـەدی فەقـێ ڕەشـید كـە دەستنوسـێكی لای مـن پارێـزراوە كۆنتریـن مزگەوتـی كـەلار بـۆ نزیكـەی سـەدەیەك بـەر لەئەمـڕۆ دەگەڕێتـەوە بێگومـان لەڕێگـەی ئـەم مزگەوەتـەوە هاوڵاتیـان و خەڵكـی ئـەم گونـدە فێـری خوێنـدن و خوێنـدەواری بـوون.

یەکەم قوتابخانەی میری (حوکمی) لە شاری کەلار ، قوتابخانەی (کەلار) بووە کە لە ۱۹۳۱/۱۰/۱ لەلایەن حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جافەوە لەو گوندە دروست کراوە کە ئەم پیاوە بۆخۆی ئەندامی پەرلەمانی عێراقی ئەوکات بووەو ماڵەکەی خۆی کردوەتە قوتابخانەو پاشتریش لەباکوری ڕۆژهەڵاتی گوندەکە بینایەك لەقوڕ بۆ قوتابخانەکە دروست دەکرێت کە تا پۆلی شەشی سەرەتایی لێ خوێنراوە بەزمانی عەرەبی و بەپێی سەرچاوەکان یەکەمین وەجبەی قوتابی کە لەو قوتابخانەیە وەرگیراوە نزیکەی ۳۳ قوتابی بوون خۆشبەختانە لەیەکەمین کاروانی خوێندواری لەم شارەدا کچانیش درێژەیان بەخوێندەواری داوە وەك ئەوەی کە دەوترێت گەر تاکێکی نێر خوێندوارو ڕۆشنبیر بێت تەنها کاریگەری بۆ خۆی هەیە بەڵام گەر تاکێکی مێ خوێندوارو ڕۆشنبیر بێت ئەوە واتا خێزانێك خوێندەوار دەبێت کە خۆشبەختانە لەیەکەم ساتەکانی کاروانی خوێندن لەم شارەدا ڕەگەزی مێیش بەشدار بوونو یەکێك لە یەکەمین کچانیش کە چووەتە قوتابخانە خاتوو حەبەخان (۱۹۲۳ ـ ۱۹۹۷) کچی کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف بووە، یەکەمین بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە مامۆستا (تۆفیق عەلی عەبدولڕەحمان) بووە کە تا ئێستا زیاتر لە ۲٦ بەڕێوەبەری هەبووەو خوێندن تائێستاش لەم قوتابخانەیە بەناوی قوتابخانەی شێروانەی بنەڕەتی بەردەوامەو کۆنترین بینای قوتابخانەیشە کە لەساڵی ۱۹۵۸ دروست کراوەو تا ئێستاش ماوەو خوێندن تێیدا بەردەوامەو لەساڵی ۲۰۱۲ دا ئەم قوتابخانە ناوەکەی لە شێروانەوە جارێکی تر دەکرێتەوە بە کەلار.

ڕەنگە بیرەوەری خوێندن لەو قوتابخانەیە لای زۆرێك لەمامۆستایان و قوتابیان هەبێت و بۆ خۆی مێژوویەکی تۆمار کرد بێت بەڵام لێرەدا ئاماژە بەبەشێك لە یاداشتەکانی خوالێخۆشبوو مامۆستا مستەفا نەریمان (۱۹۲۵ ـ ۱۹۹٤) دەدەم کە بۆ خۆی لە ۱۹٤٤/۱۰/۱۸ لەکەلار بووەتە مامۆستا کە ئەو کات دوو مامۆستا لەو قوتابخانە دەوامیان کردووە ئەوانیش مامۆستایان (زەینەڵ حسێن بەیاتی) کە بەڕێوەبەر بووە لەگەڵ مامۆستا (عەزیز مەجید بەیاتی) کە بەڕێوەبەرەکە لە نەتەوەی عەرەب و ئەوی ترشیان تورکمان بووە، مامۆستا مستەفا یادگاری تاڵ و شیرینی لەو دەمەدا لەکەلار بۆ تۆمار کردوین و دەیگێڕێتەوە کە سەرەڕای ژیانی مامۆستای و باس لە دۆخی پەروەردەی ئەو کات زۆر بیرەوەری تری بۆ بەیان کردوین کە لێرەدا من تەنها هەوڵ دەدەم تیشك بخەمە سەر لایەنی پەروەردەی لە یاداشتەکانیداو وەك لە درێژەی دەنوسێت «کەلاری ئەو سەردەمە بریتی بوو لە (۲۵۰) ماڵێك و مەرکەزی بەگزادەکانی جاف بووە، لەکەلار پێش هەموو ئاواییەك قوتابخانە کرابووە، ژمارەیی قوتابیان لە شەش پۆلدا (۵۰ ـ ٦۰) بوو، هۆی کەمی قوتابی دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی مامۆستایان بەتەواوەتی دەوامیان نەدەکردو ڕێگەی هاتوچۆی نێوان کەلارو کفری زەحمەت بوو، هەر یەکێکمان مانگ و نیوێ جارێك شارمان دەبینی و بەدڵ و بەگیان دەرسمان دەوتەوە» و لە قسەوباسەکانیدا باس لەدۆخی قوتابیەکان دەکات کە تەمەڵ و لاسار بوونەو مامۆستاکان شەخسێتان نەمابوو لای قوتابیەکان و لەپشوی نێوان دەرسەکاندا دەهاتنە نێو مامۆستاکان و دادەنیشتن و ئەمەیش بە هۆی ئەوەی کە مامۆستاکان نەیانوێراوە قسەیان لەگەڵ بکەن بەهۆی ئەوەی ئەمانە مناڵە بەگزادەبوونەو پاشان بەهۆی لێدانەوە ئەو منداڵانە دێنێتە سەر ڕێ".

مامۆستا مستەفا نەریمان وەك خۆی باسی دەکات نزیکەی دوو ساڵ لەکەلار ماوەتەوەو ئەو ماوەیە بەڕۆژە خۆشەکانی ژیانی دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ دانیشتوانەکەیدا خۆش ژیاوە، لەدرێژەی بەسەر هاتەکانیدا مامۆستا نەریمان باس لەوە دەکات «لەکەلار بووم بۆ یەکەم جار ساڵی ۱۹٤۵ ئاگری نەورۆز کرایەوەو قوتابیان سرودی نەورۆزیان خوێندەوە»، مامۆستا لەبیرەوەریەکانیدا تەنانەت ناوی هەندێك لەقوتابیە بزێوو هێمنەکانیش دەهێنێت لەوانە کە باسی دەکات قوتابیە بزێوەکان (عەلی کەریم بەگ و ئیکرامی شێخ حەسەن) و

لەبەرامبەریشدا قوتابیە هێمنەکان (سەردارو دارا) بەگ بوون، بەم شێوەیە مامۆستای خوالێخۆشبوو چەند دیمەنێکی ئەو دەمەی پەروەردەو فێربوونی کەلاری بۆ تۆمار کردوین کە بەڕاستی سودی مێژوویی گەورەی بۆ ئەمڕۆ هەیە.

یەکێك لەکێشەکانی خوێندنی ئەو کات ئەوە بوو کەقوتابی لەقۆناغی سەرەتایی دەر دەچوو دەبوو بچێتە شوێنەکانیتر بەتایبەت کفری و سلێمانی بۆ تەواو کردنی خوێندنی بەرزتری وەك ناوەندی کەئەمەیش دەبووە ڕێگر لەبەردەم پەروەردەو فێربوونی وەجبە سەرەتاییەکانی قوتابیان کە بەم هۆیەوە ژمارەیەکیان وازیان دەهێنا تا ئەو کاتەی یەکەمین قوتابخانەی ناوەندی کە سەرەتا پاشکۆ بووە لەساڵی ١٩٧٠ ئەو ساڵەی کە بەمەرسومی کۆماری و بەئیمزای سەرۆك کۆماری ئەوکاتە ئەحمەد حەسەن بەکر کەلار بڕیاری بوون بەقەزای بۆ دەرچووە لەکۆتایی مانگی شوباتی ئەو ساڵەداو خوێندکاری پۆلی شەشەمی سەرەتای قوتابخانەی کەلار دەچنە پۆلی یەکەمی ناوەندی ئەو پاشکۆیە بە هەمان ستاف کە ئەوکات بەڕێوەبەر (مامۆستا کەمال فارس عەزیز) بووەو لەکۆتایی هەمان ساڵدا یەکەمین مدەڕس لەپسپۆڕی ماتماتیك بەناوی (نەوزاد محەمەد ساڵەح) هاتوەتە ئەو قوتابخانەیە، لەساڵی ١٩٧٣ یەکەمین قوتابخانەی ناوەندی لەکەلار کراوەتەوە کە بیناکەی لەنێو بینای ئێستای پەروەردەی کەلاردا بووەو یەکەمین وەجبەی قوتابیانی نزیکەی حەفتا قوتابی بوون و پاش نسکۆی ١٩٧٥ یش قوتابیانی کەلار توشی دەردەسەری دەبن و بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوو لەکفری دەکەن و تاقیکردنەوەی وەزاری ساڵی ١٩٧٥ قوتابیان لەهەمان شار دەبێت، لەساڵانی پاش ١٩٧٥ ئامادەیی لەکەلار دەکرێتەوەو پێشتر قوتابیان بۆ تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی ڕوویان لەهەریەکە لەشارەکانی کفری و دەربەندیخان و سلێمانی دەکرد، لە ١٩٨٨/١٠/١ ئامادەیی پیشەیی کەلار بۆ هەر سێ بەشی (کارەبا، بازرگانی، کانزا) کرایەوە کە نزیکەی ٣٠٠ خوێندکار لەو ساڵەدا تێیدا خوێندویانەو یەکەمین بەڕێوەبەری مامۆستا (داود شێرزاد) بووە کە ئێستایش ئەم ئامادەییە بەردەوامە لەخوێندن ، گەر ورد ببینەوە لەو کەسانەی کە ئەوکات لەقوتابخانەکاندا دەیانخوێندو بەخوێندەوار دەناسران دەیان کەسی هەڵکەوتوویان تێدا بووە لەبوارە جۆربەجۆرەکاندا کە کاریگەرییان لەسەر لایەنی ڕوناکبیری و کۆمەڵایەتی شارەکە هەبووە.

لەپاش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ ی کۆمەڵانی خەڵك و پاش ئەوەی لە ٣/٩ شاری کەلار ئازاد دەکرێت بەجۆرێك لەجۆرەکان بواری پەروەردەو فێربوون لەمشارەدا زیاتر گەشە دەکات کە زۆرتر خوێندن دەبێت بەزمانی کوردی و ژمارەی خوێندکاران زیاد دەکات ئەمەیش وادەکات کە بینای قوتابخانەکانیش زۆر بێت، لەپاش پرۆسەی ئازادی عێراق و لە ٢٠٠٤/٦/٢٦ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی گەرمیان دامەزرا کە یەکەمین بەڕێوەبەری مامۆستا (عەلی حسێن عەلی) بووەو ئێستا ئەو بەڕێوەبەرایەتیە لە شاری کەلاردایەو پێشتر مامۆستای کۆچکردوو مستەفا ڕەشید (١٩٥٢ ـ ٢٠١٢) بەڕێوەبەری بووەو لەساڵی ٢٠١٢ دا مامۆستا دارا ئەحمەد سەمین کراوەتە بەڕێوەبەری، ئەمە جگە لەوەی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان ـ لقی گەرمیان لەدوای ڕاپەڕین لەسنورەکە هەبووەو وەك ڕێکخراوێکی پیشەیی و تایبەت بەچینی مامۆستا کاری کردووە، زەرورەتی ناوچەکە لەڕووی پەروەردەو فێربوونەوە وایکرد کە لەساڵی ١٩٩٥ وەك زۆرێك لەشارەکانی تری کوردستان بڕیار لەکردنەوەی پەیمانگاکانی (مامۆستایان، تەکنیکی) بدرێت کە پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی کەلار بڕیاری دامەزراندنی در و سەرەتا تەنها (١٠٠) خوێندکاری هەبوو لەگەڵ شەش مامۆستا کە ئەم پەیمانگایە لەسنوری ئیدارەی سلێمانیدا پاش پەیمانگای مامۆستایانی سلێمانی یەکەمین پەیمانگای سنورەکە بوو کە بڕیاری کردنەوەی دراو یەکەمین بەڕێوەبەریشی مامۆستا (عادل یاوەر) بووە، پەیمانگای کشتوکاڵی کەلار کە لە هەمان ساڵ بڕیاری کردنەوەی دراو دواتر کرا بەپەیمانگای تەکنیکی و لەساڵی خوێندنی یەکەمیدا واتا

١٩٩٦ ـ ١٩٩٧ توانـرا (٥٢) خوێنـدکار دەر بچێنێـت کـە تـا ئێسـتایش ئـەم ناوەنـدە ئەکادیمیـە بەردەوامـە لەخزمـەت و چەندیـن بەشـی زانسـتی لەبەیانیـان و ئێـواران لەخـۆ دەگرێـت بـەڵام پەیمانـگای مەڵبەنـدی مامۆسـتایان لەسـاڵی ٢٠٠٨ ەوە بـە بڕیارێـك کـرا بەکۆلێـژی پـەروەردەی بنەڕەتـی کـە ئێسـتا سـەر بـە زانکـۆی گەرمیانـەو پـاش سـاڵی ٢٠٠٤ یـش بەبڕیارێکـی سـەرۆکایەتی ئەنجومەنـی وەزیـران کۆلێـژی پـەروەردەی کـەلار دامـەزرا کـە یەکـەم ڕاگـری ئـەم کۆلیـژە دکتـۆر بەهـرۆز جـاف بـووە، ئەمـەو زەرورەتـی ناوچەکـەو زۆری ژمـارەی خوێنـدکارو بڕیـاری کردنـەوەی ژمارەیـەك زانکـۆ لـە شـارەکانی کوردسـتان لـە ٢٠١٠/٤/١٤ بـەردی بناغـەی زانکـۆی گەرمیـان لەلایـەن دکتـۆر بەرهـەم ساڵەح سـەرۆکی ئەوکاتـەی حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان دراو پاشـان دەسـت بەدروسـت کردنـی هەیکەلـی زانکـۆی گەرمیـان لەکـەلار لەناوچـەی بەردەسـور کـرا کـە لـە ٢٠١١/٢/٧ فەرمانـی زانکۆیـی بـۆ پێکهێنانـی دەرچـووە کـە ئێسـتا لەکـەلار چەندیـن بـەش لەهەریەکـە لـە کۆلێژەکانـی (پـەروەردە، بنیـاد) لـە کـەلار درێـژە بەخوێنـدن دەدەن و هـەر لەکـەلار لەسـاڵی ٢٠١٢ دا بڕیـاری کردنـەوەی خوێندنـی ماسـتەر لەبەشـی جوگرافیـا درا هـەر چەنـدە پێشـتر لەسـەر میلاکـی کـەلار چەندیـن ماسـتەر و دکتـۆر وەرگیـرا بـوو لەزانکۆکانـی تـرداو تەنانـەت زەرورەتـی ناوچەکـە و گرنگـی حکومـەت وایکـرد کـە پەیمانـگای پسـپۆڕیش بکرێتـەوەو لەسـاڵی (٢٠٠٧) پەیمانگای کۆمپیوتـەری کەلاریـش کەسـەر بەوەزارەتـی پەروەردەیـە کرایـەوە کـە لـە یەکـەم وەجبـەی خوێندنـدا تەنهـا (٥٠) خوێنـدکاری وەرگـرت و ئێسـتا ئـەم ناوەنـدە بەردەوامـە لەخزمـەت کـردن و یەکـەم بەڕێوەبـەری ئـەو پەیمانگایـەش مامۆسـتا (ناسـیار حسـین قـادر) بـووە، لەبـواری ڕاگەیاندنیشـدا پـاش بەهـاری ١٩٩١ و کردنـەوەی یەکەمیـن ڕادیـۆی سـنورەکە بەنـاوی ڕادیـۆی گەرمیـان و پاشـان گەشـەکردنی میدیـای بیسـتراوو بیـنراوو نـوسراو چەندیـن بڵاوکـراوەی تایبەتمەنـد بەبوارەکـە لەلایـەن قوتابیـان و خوێندکارانـەوە دەر کـراوە لەوانـە (کەڵیـار، تـۆژەر، پەیامـی خوێنـدکار، خوێندنـی نـوێ، شـکۆفە، تەمـا، لاو ... ) و کردنـەوەی چەندیـن لـق و ناوچـە و ناوەنـدی ڕێکخـراوەی تایبـەت بەقوتابیـان و خوێنـدکاران و لەبـواری ڕادیۆیشـدا یەکەمیـن بەرنامـەی ڕادیـۆی بەنـاوی بەرنامـەی ( بـەرەو پەروەردەیەکـی هاوچـەرخ ) لەسـاڵی ٢٠٠٧ ەوە لەڕادیـۆی تـەوارەوە پێشـکەش کـراوەو پاشـانیش لـە هەریەکـە لـە ڕادیـۆی یەکگرتـوو و ڕادیـۆی دەنگـەوە بەرنامـەی تایبـەت بەپـەروەردەو فێربـوون پێشکەشـکراوە ئەمـە سـەرەڕای بەرنامـەی تایبـەت بەڕێکخراوەکانـی قوتابیـان و لاوانـی حزبەکانـەوەو ئەمـەو هەریەکـە لەبەڕێوەبەرایەتـی گشـتی پـەروەردەی گەرمیـان سـایتێکی تایبـەت بەخۆیـان بەنـاوی http://www.pgarmyan.org/ کـردەوە لەگـەڵ سـایتی تایبـەت بەزانکـۆی گەرمیـان بەنـاوی http://www.garmianuniv.com/ و گەشـەکردنی شـارەکەو گرنگـی پێدانـی هاووڵاتیانیـش وایکـرد لەسـاڵی ٢٠١٢ دا یەکەمیـن قوتابخانـەی نێودەوڵەتـی لەشـارەکە بکرێتـەوە کـە دیسـان ژمارەیـەك خوێنـدکار تێیـدا درێـژە بەخوێنـدن دەدەن ، سـەرباری چەندیـن گرفتـی پەروەردەیـی لەشـارەکە بـەڵام بـەردەوام ئـەم کەرتـە لـە بەرەوپێشـچوندایەو لـەم سـاڵانەی دواییشـدا چەندیـن باخچـەو قوتابخانـەو پەیمانـگای تایبـەت لەشـارەکەدا کراونەتـەوەو ئایندەیەکـی گـەش چاوەڕوانـی نـەوەی داهاتـوو لـە بـواری پـەروەردەو فێربـوون لـە کـەلار ئومێـد دەکرێـت .

سەرچاوەکان :

-1 مستەفا نەریمان ، بیرەوەری یەکانی ژیانم ، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ، بەغدا ، ١٩٩٤.

2 – حوسێن ئیسـماعیل خـان دەلـۆ ، ناوچـەی کفـری لـە نێـوان سـاڵانی ١٩١٤ – ١٩٤٥ ، لـە بڵاوکراوەکانـی کۆمەڵـەی روناکبیـری و کۆمەڵایەتـی کەرکـوك ، کەرکـوك ، ٢٠١٠ .

3 – شـاخەوان فایـەق ئەلیاسـی ، مێـژووی نەتـەوە کۆنەکانـی کوردسـتان ، چاپخانـەی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری ، هەولێـر ، ٢٠٠٨ .

4 – صباح عەلی جاف ، پەروەردە و فێربوون گرفت و گۆڕان ، چاپخانەی یاد ، سلێمانی ، ٢٠١١

5 – سـوارە حەسـەن باجـەڵان ، مێـژووی کـەلار ، چاپخانـەی چـوار چـرا ، سـلێمانی ، ٢٠١١ .

6 – محەمـەد شـاکەلی ، قـەزای کفـری .. شـارەدێی کـەلار و پاسـەکەی حاجـی ١٩٦١ – ١٩٧٥ ، چاپخانـەی کارۆ ، ٢٠١٢ .

7 – مەلا ئەحمەدی فەقی رەشید مامۆستای ئاینی و دانیشتوی کەلاری کۆن، دەست نوسی بڵاونەکراوە .

8 – رێبـەری دەرچوونـی قوتابیانـی : ( پەیمانـگای تەکنیکـی کـەلار – خولـی هەشـتەم ٢٠٠٣ – ٢٠٠٤ ) ، ( پەیمانـگای مەڵبەنـدی مامۆسـتایان و هونـەرە جوانـەکان – خولـی رزگاری ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ ) .

9– چاوپێکەوتـن لەگـەڵ هـە ریەکـە لـە ( مامۆسـتا حسـین کـەلاری ، مامۆسـتا شـکور غەفـور ،مامۆسـتا ئەنـوەری صناعـە ، محەمـەد عەلـی رەزا – خوێنـدکاری سـاڵانی ١٩٧٣ز ) .

10– سایتی فەرمی پەروەردەی گەرمیان http://www.pgarmyan.org/

11 – سایتی فەرمی زانکۆی گەرمیان http://www.garmianuniv.com/

12 – سایتی خەندان http://xendan.org/

sabahali83@yahoo.com



ئاهەنگی قوتابخانەکانی کەلار لە کۆندا



گەشتی بەهارەی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی ئەرشیف:حەسەن جاف



م.سابیر حەمید لەکاتی وانە وتنەوەدا... فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان



ئاهەنگی قوتابخانەکانی کەلار لە کۆندا

# شاری کەلار..
# بزوتنەوەی ژنانو بەشێك لە دەستکەوتەکانیان
## تابان گەرمیانی

ڕەنگـە قسـەکردن لەسـەر مێـژووی خەباتـی توێژێـك لەچوارچێـوەی شـارێکی وەك کـەلاردا، لەهەندێـك ڕووەوە هاوشێوەی ژنانی ناوچەکانـی تـری کوردسـتان بێـت، بـەڵام لێرەدا لـەڕووی ژینگەی سیاسـی و ئابـوری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیـی و جوگرافیاییشـەوە، بڕێـك جیـاوازە، جیـاوازە لـەوەی ژنـان بتوانـن بەکەفمتریـن ماندووبـوون و دوور لەتوندوتیـژی خەباتـی مەدەنییانـەی خۆیـان بکـەن و دەسـتەبەری ئـەو مـاف و داواکارییانـە بـن کـە وەك سـەرەتاو دروشـم هـە ڵیانگرتـووەو لەسایەیدا خەبـات بکـەن.

بۆیـە لێـرەدا دەبێـت لەمێـژووی شـاری کـەلارەوە باسـی بزوتنـەوەی ژنانـی شـارەکە بکەیـن، چونکـە ئـەم شـارە بەهـۆی بەپیتیـی خاکەکـەی و هەڵکەوتـە جوگرافییەکەیـەوە لەسـەر ئاسـتی کوردسـتانی گـەورەو هەرێمـی کوردسـتانیش وا کەوتۆتـەوە کـە دوا سـنوری نێـوان کوردسـتانە لەبـەری هـەردوو دەوڵەتـی عێـراق و ئێـران، ئەمـەش وایکـردەوە بـەردەوام ڕووبـەڕووی سیاسـەتی ڕاگواسـتن و بەعەرەبکـردن ببێتـەوەو هەمیشـە شـارێکی نائـارام بێـت و زیانەکانـی دۆخـی مرۆیـی و دەروونـی و کۆمەڵاتـی و.. هتـد، تیایـدا بـەردەوام بێـت، کاریگەریـی سیاسـەتی تەعریبیـش لەمێـژووی بـە (قـەزا) کردنـی کـەلار خۆیـەوە دەردەکەوێـت. هەمـوو ئەزانیـن ئـەم شـارە لـەڕۆژی (١٩٧٠/٢/٢٨) بەژمـارە (١٣٧) لەپـاش ڕاگەیاندنـی ١١ ئـازار بـە مەرسـومێکی سـەرۆکایەتی کۆمـاری عێـراق کـرا بەقـەزا لەسـنوری پارێـزگای کەرکـوك، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی کـەلار خـۆی گەورەتریـن قـەزای کـوردی بـوو، تـرس هەبـوو لـەوەی دیمۆگرافیـای کوردسـتان لەکەرکـوك زیـاد بـکات، ئـەم ترسـەش وایکـرد کـە بەعـس لـەڕۆژی ( ١٩٧٥/١١/٦) بـە مەرسـومێکی تـرو بـە ژمـارە (٦٠٨) ی سـەرۆکایەتی کۆمـار شـارەکە لەپارێـزگای کەرکـوك دابـڕێـت و لـەڕووی ئیدارییـەوە بیخاتەسـەر پارێـزگای سـلێمانی، دواتـر لەسـەردەمی دەسـەڵاتی کوردیـدا وەك ناوەنـدی ناوچەکـە ببێتـە سـەنتەری ئیدارەی گەرمیـان.

بەپێـی ئـەم مێـژووە بێـت، کـەلار، وەك شـار، شـارێکی کۆن نییـە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام سیاسـەتی ستەملێکردن وچەوسـانەوەی لەسـەر بـووە، وەك دەبینیـن لەسـاڵی (١٩٨٨) دا لەتاوانـی شـاڵاوەکانی ئەنفالـدا پشـکی شـێری قوربانییـان بـەر سنوری فراوانـی ئـەم شـارەو گوندەکانـی دەروبـەری کەوتـووە، ئەوانەشـی کـە بـەر ئـەم شـاڵاوە کەوتـن زۆرینەیـان ژن و منداڵ بـوون چ وەك قوربانـی و چ وەك کەسـوکاری قوربانـی، بۆیـە دەبێـت مێـژووی ژن لەکـەلاردا بکەیـن بـە دووبەشـەوە، واتـە مێـژووی پێـش ڕاپەریـن و دوای ڕاپەریـن. پێـش ڕاپەریـن ژن ئەنفـال و دەربەدەرکـراوە، دوای ئەنفالیـش دەبینیـن هـەر خاوەنـی قوربانییـەو ژن لەپرۆسـەی ڕاگواسـتندا زۆرتریـن زیانـی بەردەکەوێـت، هـاوکات لەکوردایەتیشـدا بەشـداربووەو لەخەباتـی پێشـمەرگایەتیدا هاوشـان و پشـتیوانی بـاوك و بـراو هاوسـەرەکانیان بوونـە، لـەوەش زیاتـر چەنـدان ژن بەهـۆی پەیوەنـدی و کاری سیاسـیی خێزانەکانیانـەوە لەدامودەزگاکانـی بەعسـدا، زیندانـی کـراون.

لـەدوای ڕاپەرینـی سـاڵی (١٩٩١) ی خەڵکـی کوردسـتانەوە، قۆناغەکـە گـۆڕاوە، دەرفەتـی ئازادیـی سیاسـی هاتـە ئاراوە، ژنانـی کەلاریـش توانیـان لەپـاڵ بەشـداریی سیاسـییان، خۆیـان لەنـاو چەندیـن ڕێکخـراوی جۆراجـۆردا ڕێـك بخـەن و شـاری کەلاریـش یەکێـك بـووە لـەو شـارانەی چەندیـن ڕێکخـراو و گـروپ و دەسـتەو ناوەنـدی هاوبەشـی

بـۆ ژنـان تێـدا دروسـت دەبێـت، کۆمەڵێـك ژنـی بەتوانـاش لەنـاو ڕێکخراوەکانـدا دەسـتبەکاردەبن لەڕێکخراوەکانـی وەك یەکێتـی ژنانـی کوردسـتان و یەکێتـی ئافرەتانـی کوردسـتان و یەکگرتـووی خوشـکانی ئیسـلامی و کۆمەڵـەی ئافرەتانـی کوردسـتان و سـەنتەری رووناکبیـری ژنـان و بزوتنـەوەی خوشـکان، ئەمـە جگـە لـەوەی لەنـاو حزبـە سیاسیەکانیشـدا کۆمەڵێـك ژن هەڵکەوتـن.

ئـەم ڕێکخراوانـە سـەرەڕای جیاوازییـە سیاسـییەکانیان لەکۆمەڵێـك خاڵـدا هاوبـەش بـوون و لەشـاری کـەلاردا پێکـەوەو بەجیـا کاریـان بـۆ دابینکردنـی مافەکانـی ژن کـردووە، ئەویـش لەڕێـگای کـۆڕو کۆبوونـەوەو کۆنفرانـس و سیمنار و دەرکرنـی بەیاننامـە و یاداشـت، بـەوەش قۆنـاغ بەقۆنـاغ ژنانیـان بـە مـاف و ئەرکـە سیاسـی و کۆمەڵایەتی و یاسـاییەکانیان ئاشـنا دەکـرد، لەوانـە کارکـردن بـۆ گۆڕینـی یاسـاکان کـە ژنـی تێـدا پلـە دوو بـوو، نەهێشـتنی کوشـتن و خۆکوشـتن و خۆسـوتاندنی ژنـان، نەمانـی دیـاردەی خەتەنەکـردن، یـان بـەزۆر بەشـودانی کچـان و دیـاردەی ژن بـە ژن، هەروەهـا بەردەوامبـوون لەخوێنـدن و خوێنـدەواری و، هاندانـی ژنـان و کچـان بـۆ کارکـردن و بەدەسـتهێنانی سـەرچاوەی ئابـوری تایبـەت بـۆ خۆیـان و گرنگیـدان بـە دەسـتڕەنگینی و کارە دەسـتییەکان.

جگـە لەوانـە، هاندانـی ژنان بـۆ بەشـداریکردن لەهەموو کارە هونەرییەکاندا وەك شـانۆو شـێوەکاری و پەیکەرتاشـی و میوزیـك، هاندانـی ژنانـی شـارەکە بـۆ بەشـداریی لـەکاری میدیایـی ونوسـین و خوێندنـەوە، پاڵپشـتیکردنیان بـۆ بەشـداریی زیاتـر لەحزبـە سیاسـیەکاندا، کارکردنیـش بـۆ باشـکردنی لایەنـی دەروونـی و یاسـایی ژنانـی کەسـوکاری ئەنفـال، هەروەهـا ڕۆشـنبیریی دایـکان لەبـواری پەروەدەیـی هتـد..

ئەمـڕۆ خۆشـبەخانە، دەرئەنجامـی زۆرێـك لـەم هـەوڵ وکۆششـانە بەدەرکەوتـوون. ژنانـی کـەلار توانیـان بگـەن بـە بەرزتریـن ئاسـتی دەسـەڵاتی یاسـادانان و حکومەتـە خۆجێییـەکان. هـەر لەنـاو کـەلاردا دوو ژن بوونەتـە ئەندامـی پەرلەمانـی کوردسـتان و یـەك ژنیـش بۆتـە ئەندامـی ئەنجومەنـی پارێـزگای سـلێمانی، بـۆ یەکەمجـار لەسـەر ئاسـتی عێـراق و کوردسـتانیش ژنێـك بووەتـە بەڕێوەبـەری ناحیـەی باوەنـور، ژنێکیـش بووەتـە سـەرۆکی شـارەوانی و چـوار ژنیـش بوونەتـە بەڕێوەبـەری کتێبخانەکانـی کـەلار و باوەنـور و ڕزگاری کـە هـەر سـەربە کـەلارن، لـە کـۆی (٣٦) بەڕێوەبەرایەتییـش یـەك بەڕێوەبەرایەتـی تایبـەت بێـت بـە بەرەنگاربوونـەوەی توندوتیژیـی دژ بـە ژنـان و سـێ نوسینگەشـی هەبێـت، هـەر لەکـەلاردا شـەڵتەرێکی تایبـەت بـە داڵدەدانـی ژنـان هەبێـت و دوو ژنیـش بەڕێوەبـەری بـن لەشـارەکەدا یەکێکیـان لەبەڕێوەبەرایەتـی کشـتووکاڵ و ئەویتریـان لـە بانکـی کـەلار.

لەمەیدانـی کاریشـدا، ئەمـڕۆ ژنـی کـەلار بۆتـە خاوەنـی مەلەوانگـە، گەرمـاو، هۆڵـی وەرزشـی تایبـەت بەژنـان، چێشـتخانە، نانەواخانـەو دوکانداریـی. لەبـواری میدیـای نـوسراوو بیـنراوو بیستراویشـدا، ژنـان لەکـەلار خاوەنـی یەکـەم ڕادیـۆی ژنـان بـوون بەنـاوی (تـەوار) کـە لەسـەر ئاسـتی عێـراق و کوردسـتان بـوو، خاوەنـی یەکـەم بڵاوکـراوەی ژنانیشـن بەنـاوی (کەنـاری ژن) و (پاریـا) و (نەوژیـن). لەتێکـڕای گۆڤـار و ڕۆژنامـەو بڵاوکراوەکانـی گەرمیانیشـدا لەسـتافی نووسـیندا ژنانـی کـەلار بوونیـان هەیـەو هەبـووە، لەسـەرجەم ڕادیـۆو تەلەفزیۆنـە لۆکاڵییەکانـی کەلاریشـدا ژنانـی بێـژەرو دەهێنـەرو هەواڵسـاز هەبـووەو هـەن، لەبـواری سەربازییشـدا هێـزی پێشـمەرگەی ژنـان هەیـە، لەبـواری هێزەکانـی ناوخۆیـش چەندیـن ژن لەهاتووچـۆ و پاسـەپۆرت هـەن، ئەمانـەو چەندیـن دەسـتکەتیتر کـە بەرهەمـی بزووتنـەوەی ژنانـن لەشـاری کـەلار.

لێـرەدا پرسـیارێك دێتـە ئـاراوە، ئایـا ئـەم دەسـتكەوتانە كەمـن؟ ئەگـەر ئـا، هـۆكارەكان چیـن و بـۆ كـەم و لەئاسـت خەبـات و ماندووبوونـی ڕێكخـراوەكان و چالاكوانانـی ژنـی كـەلاردا نیـن؟، ئەگەریـش زۆرن، ئـەوا بەدڵنیاییـەوە دەبێـت شـانازییان پێـوە بكەیـن و ڕۆڵ ودەستپێشـخەری ئـەو ژنانـەش لەمێـژووی شـاری كـەلاردا لەبەرچـاو بگیرێـت كـە ڕۆژێـك لـەڕۆژان بونەتـە ڕچەشـكێن و دابونەریتـە خراپەكانیـان شـكاندووەو توانیویانـە گۆڕانكاریـی كۆمەڵایەتـی لەژیانـی ژنانـی شـاری كـەلاردا بكـەن.




بزاوتی ژنان ... فۆتۆ: گروپی مەستورە



بزاوتی ژنان ... فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان



بزاوتی ژنان ... فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان

# کۆمەڵی مەدەنی لە کەلار دا

## بێستون ژاڵەیی

سەرەتای جموجوڵی مەدەنی لەکەلاردا پەیوەستە بەوەی بەگزادە جافەکان لەم شارەدێیەدا بوون و زۆر زوو قوتابخانە و نەخۆشخانە و بنکەی پۆلیس و پۆستەخانەیان هێناوەتە ئێرە و هەر خۆشیان ئەنگێزەی سیاسی و ژیانی شاریان هەبووە ، داودبەگی جاف و حەمە بەگی جاف لێرەوە بۆ چەندین خول نوێنەری ناوچەکە بوون لە پەرلەمانی عێراقدا.

پێش ئەوەش بە ئەنگێزەی ئاینی عەشیرەتەکانی کەلار لەشەڕی شوعەیبیەی ساڵی ١٩١٥دا لەپاڵ لەشکری شێخ مەحمووددا دژی ئینگلیز جەنگاون و هەر ئەم عەشیرەتانە جارێکی تر لە ساڵی ١٩٣١ دا لەشەڕی ئاوباریکدا پشتی شێخیان لەشەڕ لە دژی ئینگلیزدا گرتووە ، کاتێکیش ڕێکخراوی ئازادی کوردستان وەك دەرکەوتەیەکی ژیانی مەدەنی لە کۆتایی بیستەکاندا دادەمەزرێ حەمەبەگی جاف و چەندین پیاوی تیرەکانی جاف تیایدا جموجوڵ وچالاکی دەکەن . لەساڵی ١٩٣٩ کە حیزبی هیواش دامەزرا کەلارییەکان لە کۆڵەکەکانی حیزبەکە بوون، هەر ئەمەش وایکرد کە کۆبونەوەی دوو باڵە ناکۆکەکەی هیوا لەساڵی ١٩٤٤دا لە کەلار ئەنجام بدرێت، کە بۆ ئەو کاتە جوڵەیەکی مەدەنی و سیاسی بەرچاو بوو.

لەشەستەکانی سەدەی ڕابردووشدا لە کاتی پەرەسەندنی کێشە و ناکۆکییەکانی هەردوو باڵی مەلایی و جەلالی لەناو پارتیدا، گوندی کەلاری کۆن کە ئێستا گەڕەکێکی شارەکەیە، ناوەندێکی گرنگی جموجوڵی مەدەنی و سیاسی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی (جەلالی) بووە و چەندین کۆبوونەوەی گرنگیان لە گوندەکە ئەنجامداوە.

هەروەك جەنگاوەرانی هۆزەکانی کەلار بەشێکی کارای لەشکری شۆڕشەکەی ئیبراهیم خانی دەلۆ بوون کە لە ٢٢ ی ئابی ١٩٢٢ دا کفرییان لە چنگی داگیرکەرانی ئینگلیز ئازاد کرد و ئیدارەیەکی کوردییان لە پیاوانی هۆزەکان تێدا دامەزراند.

لەوە بە دواش کە حیزبی شیوعی و پارتی دیموکرات و یەکێتی نیشتیمانی و حیزبە کوردستانیەکانی تریش دامەزران کەلارییەکان لەم حیزبانە و ڕێکخراوە گەنجانە و ژنانە و قوتابی و خوێندکارییەکانی ئەم هێزە سیاسیانەدا تەڤلی بوون و جۆرەها جموجوڵی مەدەنییان ئەنجام داوە و زۆرێکیان بەم ڕێگایەی خەباتدا گیانیان بەخشیوە.

ئەگەر بەوردی بەدوای چالاکیەکی مەدەنی بەرچاودا لە کەلار بگەڕێین ، وەك دەستپێك بۆ ئەم جۆرە لە جموجوڵ ئەوا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ساڵی ١٩٨٤ و دەورانی موفاوەزاتی ڕژێمی بەعس و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ئەڵبەتە ماوەی ئەو مفاوەزاتە جۆش و خرۆشی میللی خەڵك زۆر چووە بان، بەجۆرێك هەر لەو سەروبەندەدا و لەمانگی یەکی ١٩٨٤ دا قوتابی و خوێندکاران و چین و توێژەکانی تریش دەڕژانە سەر جادە و دروشمی میللی و دژی داگیرکەری بەعسیان دەوتەوە، خۆپیشاندانەکان تا دەهات گەرم و گوڕ و پڕ جۆش و خرۆشتر دەبوون، سەرەنجام بارودۆخەکە لە ژێر کۆنترۆڵی هێزە ئەمنییەکانی بەعس لە کەلار دەرچوو، ڕۆژی ١٧ ی کانونی دووەمی ١٩٨٤ کە خۆپیشاندانی چین و توێژەکان لە کەلاردا گەیشتبووە ترۆپك

ڕژێـم کاروانێـك ئەمـن و ئیسـتخبارات و تـەواری لـە سـلێمانیەوە هێنـا بـۆ سـەرکوتکردنی خۆپیشـاندانەکان، ئـەو هێـزە دڕندانـە بەربوونـە گیانـی خۆپیشـاندەرانی مەدەنـی و تەقەیـان لـێ کـردن، سـەرەنجام خۆپیشـاندەرێك بەنـاوی جمعـە ڕۆسـتەم شـەهید بـوو، کـە دواتـر تەرمەکـەی بـە خۆپیشـاندانێکی جەمـاوەری گـەورە بەپـێ برایـە گۆڕسـتانی بەرلـوت و لـەوێ بەخـاك سـپێردرا، ناشـتنی تەرمـی ئـەو شـەهیدە لـە قەدەرێکـی سـەیر و دووبـارەدا زۆر لەمەراسـیمی ناشـتنی تەرمـی شـەهیدی قەڵـەم کاوە گەرمیانـی دەچـوو کـە نزیکـەی سـی سـاڵ دوای ئـەوە شـەهیدکرا و لـە ٦ ی کانونـی یەکەمـی ٢٠١٣ دا بەمەراسـیمێکی پـڕ تووڕەیـی وجـۆش وخـرۆش بەخـاك سـپێردرا و لـەو شۆڕشـگێڕانەی ١٩٨٤ تۆمەتبـار بـوون بـە تیرۆرکردنـی کـە ئەوکاتـە ئەوەنـدە پـاك وپیـرۆز بـوون لـە چـاوی خەڵکـدا ، بەئاماژەیەکیـان سـەدان کـەس ئامـادەی خـۆ بەکوشـتدان بـوون.

ساتەوەختی ڕاپەڕینـی بەهـاری ١٩٩١ یـش جوڵەیەکـی مەدەنـی جەمـاوەری بـوو، کـە حیزبـە تەقلیـدی و چالاکیـە تەقلیدیـە پێشـمەرگانەکانی تێپەڕانـد و تـەواوی دەنـگ و ڕەنـگ و چیـن وتوێـژەکان بوونـە بەشـێك لـەم جۆشـان و خرۆشـانە میللیـە، ئـەم سـاتە مێژووییـە یەکلایـی کەرەوەیـە کـە لـە کـەلاردا کەوتـە ٩ ی ئـازاری ١٩٩١ دەرگایەکـی فراوانـی ژیانـی مەدەنـی کـردەوە

کـۆڕەوە ملیۆنیەکـەی کۆتایـی ئـازاری ١٩٩١ یـش کـە هەمـوو کەلارییـەکان تیایـدا بەشـدار بـوون و هەمـووان مـاڵ و حاڵـی خۆیـان بـەرەو سـنورەکان جێهێشـت، ئەمـەش بایکۆتکردنێکـی مەدەنـی جەمـاوەری ملیۆنـی مەدەنـی بـێ وێنـەی مێـژووی کـوردی باشـوور بـوو. لێـرە بـەدواش و دوای گەڕانـەوەی خەڵـك لـە ئاوارەیـی، کـە بەعـس دام ودەزگاکانـی لەکوردسـتان کشـاندەوە ، بۆشـاییەکی ئیـداری لـە کەلاریـش دروسـت بـوو، لـەو سـەروبەندەدا ئیدارەی تـازەی بـەرەی کوردسـتانی توانـای دابینکردنـی تەنانـەت پێداویسـتیەکانی کتێـب و قیرتاسـیەی قوتابیانیشـی نەبـوو، هـەر ئـەوکات ژمارەیـەك مامۆسـتا و چالاکوانـی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ئایینـی دەسـتەیەکیان بـۆ کۆکردنـەوەی کۆمـەك بـۆ دابیـن کردنـی پێداویسـتیەکانی قوتابـی و خوێنـدکاران پێکهێنا، دەسـتەکە لەڕێی هەڵمەتـی کۆکردنەوەی کۆمـەك بەچالاکـی جەمـاوەری جیاجیـا توانـی نزیکـەی ٣٦٠٠٠ دینـاری سـویسری کـۆ بکاتـەوە، کـە ١٢٠٠٠ دینـار لەوپارەیـە بەبانگـەوازی مامۆسـتایانی ئایینـی لـە مزگەوتـەکان کۆکرایـەوە، دواتـر پارەکـە لەڕێـی لیژنەیەکـەوە درایـە پێداویسـتیەکانی تەلەبـە و بەسـەریاندا دابـەش کـرا.

هـەر لەسـاڵی ١٩٩١یشـدا چالاکیەکـی مەدەنـی سەرنجڕاکێشـی تـر لـە کـەلار ئەنجـام درا ، ئەویـش خۆپیشـاندان و پێکهێنانـی دەسـتەیەکی مەدەنـی بـوو بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەی دیـاردەی ئاودیوکردنـی کەرەسـتەکانی ژێرخـان لەلایـەن بەرپرسـانی حیزبـە دەسـەڵاتدارەکانەوە ئەنجـام ئـەدرا ، ئـەوەی ئەوکاتـە چالاکوانـەکان و خەڵکـی هێنایـە سـەر جـادە هێنانـی ئامێرێکـی هەڵهێنـەری هێلکـە بـوو بـۆ ئاودیوکـردن لەلایـەن چـەن بەرپرسـێکی یەکێتـی و سۆسیالیسـتی ئـەو کاتـەوە، دەسـتەی ناڕەزایەتیەکـەی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی ئاودیوکـردن خۆپیشـاندانێکی گـەورەی لەبـەردەم قوتابخانـەی لەیلاقاسـمەوە بـۆ لای باخچـەی سـاوایانی پشـت قوتابخانەکـە ئەنجـام دا کـە بـارەگای یەکێتـی بـوو ، پاشـتریش دەسـتەکە دەیـان بەرپرسـی بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە دۆسـیەی ئاودیـو کردنەکـە بانـگ کـرد . ڕوداوێکـی مەدەنـی بەنـاو و دەنگـی سـەروەختی ڕاپەڕینیـش خۆپیشـاندان و مانگرتنـی کۆتایی ١٩٩١ بـوو لەبەردەم ماڵـی مسـتەفا بەگـی جافـدا، کـە ئـەو دەم نوێنەرایەتیەکـی ڕێکخـراوی یوئێنـی تێـدا بـوو، داواکاری مانگرتـووان لەخـواردن ئـەوە بـوو کـە کـەلار بخرێتـە نـاو هێڵـی ٣٦ ی دژەفڕینـەوە و لەلایـەن هاوپەیمانانـەوە لـە پەلامارەکانـی بەعـس پارێـزراو بێـت، ڕۆژانـە سـەدان کـەس لـە ژنـان وقوتابیـان و هونەرمەنـدان و چیـن و توێژەکانـی باوەنـور و دەربەندیخانیـش بـۆ پاڵپشـتی لـە مانگرتـوان بـە ڕێپێـوان دەهاتنـە شـوێنی خۆپیشـاندانەکە و چالاکـی جـۆراو

جۆریـان ئەنجـام ئـەدا.

ساڵی ١٩٩٣ لەکـەلار شـایەدی دوو چالاکـی مەدەنـی جـۆری بـوو، کـە لەیەکەمیانـدا دەسـتەیەك چالاکـوان لەسـەر سـوتانی وێسـتگەی کارەبـای کـەلار و بـێ کارەبایـی خەڵـك لـە هاوینـی ئـەو سـاڵەدا گردبوونـەوە و یاداشـتێکی توندیـان ئاراسـتەی مـام جـەلال کـرد و مـاوەی ١٥ ڕۆژیـان بـۆ چاککردنـەوەی وێسـتگەکە دانـا و بـۆ یەکەمجـار زاراوەی «بـە پێچەوانـەوە ڕێوشـوێنی تـر ئەگرینـە بـەر» یـان بـەکار هێنـا ، بەکـردەوەش لـەو ماوەیـەدا وێسـتگەکە چـاك کرایـەوە، هـەر لـەو سـاڵەدا و لـە کاتـی شـەڕی یەکێتـی وپارتیـدا لـە دژی پەکەکـە کـە کۆمەنیسـت و نەتەوەییـەکان دژی ئـەم شـەڕە چالاکیـان ئەنجـام ئـەدا، بڕێـك تـی ئێـن تـی لـە چایخانـەی شـوێنی دانیشـتنی چـەپ و قەومیەکانـدا تەقیـەوە و مەجیـد سـاڵەحی تێـدا برینـدار بـوو، ئاسایشـی هاوبـەش بـە دانانـی تەقینەوەکـە تۆمەتبـار کـرا. هـەر لـەو سـاڵانەدا بەهـۆی نـا عەدالەتـی لـە دابەشـکردنی بایەعیـدا بەجۆرێـك ژمارەیـەك خێـزان بایەعیـان بـۆ نەهاتبـوەوە، لەکـەلار خۆپیشـاندانێکی بەرفـراوان ئەنجامـدرا و لـە ئەنجامـدا چەنـد هاوڵاتییـەك برینداربـوون.

سـاڵانی سـەرەتای ڕاپەڕیـن چەنـد ڕادیـۆ و تیڤیەکـی لۆکاڵـی و ڕۆژنامەیەکـی حیزبیـش پەیامنێریـان لـە کـەلار هەبـوو کـە ئـەم کەناڵانـە و ڕۆژنامەنووسـەکانیان ڕۆڵـی بەرچاویـان لـە فراوانکردنـی پەراوێـزی ژیانـی مەدەنـی ئـەو کاتـی کـەلاردا هەبـوو، هـەروەك کـۆڕە سیاسـی و ڕوناکبیریەکانـی هۆڵـی هونەرمەنـدان و کۆمەڵـە و تیپـە هونـەری وشـانۆیی و ڕوناکبیریەکانیـش بەشـێك بـوون لـە سـیمای جموجوڵـی مەدەنـی ئـەو ڕۆژگارە، کـە دیوێکـی تـری ئـەم پەراوێـزی مەدەنـی بوونـەی نـەوەدەکان ئـەو کەسـایەتیە کۆمەڵایەتـی و ئاینییانـە بـوون کـە لەکاتـی شـەڕەکانی حیزبەکانـدا هەوڵـی سـوڵح و ئاشـتەواییان لەنێوانـدا ئـەدان. لاپەڕەیەکـی تـری ژیانـی مەدەنـی ئەودەمیـش ڕێکخـراوە کۆمـەك بەخشـەکانی کـرا و کـرۆ و قەندیـل و ڕابیتـە و ئیغاسـە و زۆری تریـش دەیـان نەخشـاند کـە خزمەتـی مەدەنـی و خێرخـوازی و خۆبەخشـیان دەکـرد.

لـە دوای پرۆسـەی ئـازادی عیراقیشـەوە کۆمەڵـی مەدەنـی لـە کـەلاردا هەنگاوێکـی تـری بەرچـاوی نـا ، لـە کـەلار چەندیـن ڕۆژنامـەی لۆکاڵـی دەرچـوون ، چەندیـن ڕێکخـراوی ئێـن جـی ئـۆ دامـەزران لـە چەشـنی «دەسـتەی هەنـگاو ، ڕێکخـراوی شـەفافیەت بـۆ نەهێشـتنی گەندەڵـی ، پەیامـی خەڵـك ، کۆمەڵـەی داکۆکـی لـە قوربانیانـی ئەنفـال ، چـواردەی چـوار» و چەندانـی تـر ، لەپـاڵ ڕێکخـراوە لۆکاڵیـە خێرخوازیەکانـی « ژیـان ، دۆسـتان ، پـرۆژە ، سـۆز « هـی تریشـدا.

ئابـی ٢٠٠٥ جوڵەیەکـی مەدەنـی جیاتـر لـە کـەلار کـرا، کـە چەنـد گەنجێـك کۆمەڵـەی بەمەدەنیکردنـی (کـەلار ـ ڕزگاری) یـان دامەزرانـد و سەرپەرشـتی خۆپیشـاندانی تونـد و جـدی و بـێ پێشـینەی ٧ی ئەیلولـی ٢٠٠٥ یـان کـرد، کـە بـۆ داخوازیـە سـەرەتاییەکانی ئـاو و کارەبـا بـوو، بـەڵام بەکارهێنانـی توندوتیـژی لەلایـەن هێـزە ئەمنیەکانـەوە بەرامبـەر خۆپیشـاندەران بـووە هـۆی برینداربوونـی ژمارەیـەك خۆپیشـاندەر. هەروەهـا لـە ٢٠٠٦/٨/٨ جارێکیـتر گەنجانـی کـەلار لەبەرامبـەر کەمـی خزمەتگوزاریـدا خۆپیشـاندانی جەماوەرییـان لـە نـاو بـازاڕی سـەرەکی کـەلار ئەنجامـدا و دیسـان هێـزە ئەمنییـەکان بـە گوللـە ڕووبـەڕووی خۆپیشـاندان بوونـەوە بـەو هۆیەشـەوە گەنجێـك بەنـاوی (ئاریـان مەحمـود) شـەهید بـوو ژمارەیـەك خۆپیشـاندەری تریـش برینـدار بـوون، وەرچەرخانێکـی مەدەنـی تـر لـە گەرمیـان پێکهێنانـی ناوەنـدی کاری هاوبەشـی ڕێکخراوەکانـی گەرمیـان بـوو لە سـاڵی ٢٠٠٦ دا ، ئـەم ناوەندە کـە لـە ڕێکخـراوە پیشـەییەکانی حیزبـەکان پێکهێـنرا زۆر دۆسـیەی مەترسـیداری گەندەڵـی ئاشـکرا کـرد و میدیـا و

ڕای گشتی لـەدژ هێنایـە سـەرخەت و گەندەڵکارانـی زۆر ترسـاند ، دواتریـش لەگـەڵ خۆپیشـاندانەکانی شـوباتی ۲۰۱۱ دا کـە ڕۆژی ۲۵ ی شـوباتی ئـەو سـاڵە دیسـان هێـزە ئەمنیـەکان خۆپیشـاندەرانیان لـە خوێنـدا گەوزانـد و دوو شـەهید و دەیـان بریـنداری لـە کـەلار لـێ کەوتـەوە ، هـەر ئەوکاتیـش کۆمەڵێـك گەنـج گروپـی کاری مەدەنـی ۲۵ ی شـوباتیان بـۆ چاکـەی گشـتی دامەزرانـد، لەوێـوە گرتـن و ئەشـکەنجەدان و ترسـاندنی گەنجـان و چالاکانـی مەدەنـی بەربـڵاو و ڕێکخـراو و توندتـر کـرا، ئـەو ڕۆژانـە پەیامنێرانـی میدیـای ئەهلـی و ئۆپۆزسـیۆن ڕۆڵـی دیاریـان لـە جموجوڵـی میدیایـی مەدەنیـدا دەبینـی ، هـەر ئـەو حیراکـەش دامەزراندنـی ڕادیـۆی دەنگـی لێکەوتـەوە کـە سـەرەڕای بەئامانـج کردنـی لەسـەرەتاوە بـەلام ڕۆڵـی بەرچـاوی لـە بڵاوکردنـەوەی کەلتـوری مەدەنیـدا بینـی ، تـا کار گەیشـتە تیرۆرکردنـی یەکێـك لـە ڕووە دیـار و گەشـەکانی ئـەم نەوەیـە شـەهید کاوە گەرمیانـی لـە ٥ ی کانونـی یەکەمـی ۲۰۱۳ دا ، شـەهادەتی کاوە لـەوە بـەدوا بـووە هەوێنـی زۆر چالاکـی مەدەنـی کاریگـەر لەلایـەن هـاوڕێ و هاوپیشـەکانیەوە.

هـەر لـە درێـژەی کاروچالاکـی مەدەنـی لـە کـەلار لـە ۱۰ ی تشرینـی یەکەمـی ۲۰۱٥ دا دوای ئـەوەی کۆبوونـەوەی لایەنەسیاسـییەکان بـە بنبەسـت گەیشـت و قەیرانەکانـی هەرێـم ناهاتنـە چارەسـەر، لـە شـاری کـەلار گەنجـان و چیـن و توێـژە جیـاوازەکان خۆپیشـاندانێکیان بـۆ بـەردەم لقـی ۲۲ ی گەرمیانی پارتـی ئەنجامدا و دواتر خۆپیشـاندان گوسـترایەوە بـۆ بـەردەم ناوچـەی کـەلاری پارتـی لـە گەڕەکـی شـۆڕش و دواتـر بەهـۆی بەرپەرچدانـەوەی پاسـەوان و چەکدارانـی ناوچـە بـە گوللـە دوو گەنـج بـە ناوەکانـی (ئـارام بایـز عوبێـد) و (عوسـمان عەدنـان) شـەهید بـوون و ژمارەیەکـی تریـش برینـدار بـوون.

دوایـن وێسـتگەی کاروجوڵـەی مەدەنـی لـە کۆتایـی ۲۰۱٦ لـەو فۆرمـەی خۆپیشـاندان و ناڕەزایەتـی مەدەنـی مامۆسـتایان و فەرمانبەرانـدا بـوو کـە هێـزە سیاسـی و ڕێکخـراوە تەقلیدیەکانـی تێپەڕانـد و خۆپیشـاندەران خۆیـان خۆیـان ڕێکخسـت و تەنیـا خۆیـان نوێنـەری خۆیـان بـوون و لەجیاتـی خۆیـان قسـەیان کـرد ، لەکۆتایشـدا گرنگـە ئـەوە بڵێـم کـە ئێمـە لـەم وتـارەدا قسـەمان لـە ڕوبەرێکـی بـێ سـەرچاوە و قسـە لـێ نەکـراو کـردووە ، کـە ئیشـی واش بـە دڵنیاییـەوە پـڕە لـە کەموکـوڕی ، چاوەڕێـم لـە ئێـوە هەڵەکانـم بـۆ ڕاسـت کەنـەوە و ئـەو نەوتراوانـەش لەسـەر جموجوڵـی مەدەنـی لەکـەلار بڵێـن ، کـە مـن پەیـم پـێ نەبـردووە ، سوپاسـی زۆریشـم بـۆ مامۆسـتا ئەحمەد نیزامەدیـن و دادوەر حسـێن محێدیـن و هونەرمەنـد سەربەسـت حاجـی ئەحمـەد و نووسـەر و ڕۆژنامەنـووس مەجیـد سـاڵح و چالاکـوان ڕێبیـن تەهـا کەڵکـم لـە زانیاریەکانیـان وەرگـرت.



خۆپیشاندان و مانگرتنی ۱۹۹۱



خۆپیشاندانی ۲۰۰٥... فۆتۆ: ئارام ئیکرام



خۆپیشاندانی ۲۰۰٦... فۆتۆ: جەزا محمد

# شانۆی کەلار

## محەمەد سابیر کەمەر

شـانۆ .. وشـەیەکی یۆنانییـە لەوشـەی درامـاوە  هاتـووە مانـای (کار = فرمـان) دەگەیەنێـت، شـانۆ لەسـەردەمی یۆنانییەکانـی کۆنـەوە سـەریهەڵداوە وەك وشـەی شـانۆو کاری شـانۆیی، دیارە پێشـتریش لەسـەردەمی سـەرەتاکانی مێـژوی مرۆڤایەتـی هەمـوو جـۆرە یارییەکیـان ئەنجامـدەدا بـۆ بۆنـەو ئاهەنگەکانـی لەدایکبـونو زیاتریـش بـۆ نـاو کۆشـکەکانی پاشـاکان بـەڵام ناویـان لێنەدەنـا شـانۆ.

وشـەی شـانۆ لەتورکیـای سـەدەی ١٦ هاتـە نـاو هونـەرو مێـژوی شـانۆی کوردیـەوە، دیـارە لەهەمـوو شـارو شـارۆچکەکان شـانۆو سـەرهەڵدانی شـانۆ ڕاسـتەوخۆ وەك گـروپ یـان بەشـێوەی ئەکادیمـی کاری تیـا نەکـراوە بەڵکـو هـەروەك پێـش سـەرهەڵدانی شـانۆ لەیۆنـان کـە بـۆ بۆنـەکان ئەنجـام دەدرا لـە کوردسـتانیش بەهەمانشـێوە بـوو، لەهـەر شـارێك لەشـارەکانی کوردسـتان بـاس بکەیـن نمایشـی لاکـۆڵانو دیوەخـانو قوتابخانـەکان هەبـوەو ئەنجامـدراوە لەکەلاریـش لـە ساڵەکانی سییەکان لەکـەلاری کۆنـەوە چەندیـن نمایـش پێشـکەش کراوە بۆ مەبەسـتی یـادی نـەورۆزو یادەکانـی تـرو لـە قوتابخانـەی کـەلاری کـۆن لەلایـەن خوێنـدکارانو پیـاوانو گەنجانـی کـەلارەوە چەندیـن نمایـشو چەندینجـار کاری هونـەری نوانـدن ئاسـا کـراوە.

بـەڵام ئـەوەی وەك تیپـی هونـەریو شـانۆی ئەکادیمـی باسـی بکەیـن سـاڵی ١٩٨٣ لەلایـەن چـەن خوێندکارێکـی هونـەرە جوانەکانـی کـەلارەوە کـە لەسـلێمانی بـۆ ئەومەبەسـتە لەخوێنـدن بـون، دوای تەواوکردنـی پەیمانـگا تیپێکیـان دروسـت کـرد لەگـەڵ چەنـد کەسـێکی ڕۆشـنبیری شـاری کـەلار ئەوانـەش کـە جێدەسـتیان دیـار بـوو لـە دامەزراندنەکـە بریتـی بـوون لـە سەربەسـت ئەحمـەدو کەریـم حسـێنو محەمـەد حەسـەن، دواتریـش چەنـد کەسـایەتیو مامۆسـتایەك هـەم ئاهەنگیـان بـون تیپەکەشـیان ناونـا (تیپـی شـانۆو مۆسـیقای گەرمیـان) کـە یەکـەم تیـپ بـوو لەسـەر ئاسـتی شـاری کـەلارو لـە مانگـی حوزەیرانـی سـاڵی ١٩٨٦ دامـەزرا، هەمـان سـاڵ ١٩٨٦، تیپـی شانۆی سـیروان دامـەزرا لەلایـەن مەجیـد ساڵەحو کامـەران فایـەقو عوسـمان عەبدولقـادرو چەندکەسـێکی تـرەوە، بـەدوای ئەویشـدا تیپێکـی تـری شـانۆیی دروسـت دەبێـت بەنـاوی (تیپـی شـانۆی پێشـڕەو) بـۆ زیاتـر خزمەتکـردن بەهونـەری شـانۆ لەشـارەکەو بیرۆکـەی دامەزراندنەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ (مەحمـود محەمـەد نـاسر، عوسـمان سـەید حسـێن، ئەکـرەم عەبدوڵـڵا، رزگار حاجـی حەمیـد، کامـەران عەلـی تۆفیـق، شـێخ لەتیـف) لەپـاش ئەوانیـش تیپـی شـانۆی منداڵانـی گەرمیـان لەسـاڵی ١٩٩٣ لەلایـەن عوسـمان گەرمیانییـەوە دامـەزراو چەنـد منداڵێکـی لـەدەور کۆبـوەوە کـە لەسـاڵی ١٩٩٧ەوە بەنـدە سـەرۆکی ئـەو تیپەیـە.

سـەرەتای سـاڵی ١٩٩٠ لقـی کـەلاری کۆمەڵـەی هونـەرە جوانەکانـی کـورد بـارەگای خـۆی دەکاتـەوەو لێـرە بـەدواوە بەشـێکی زۆری کارە شـانۆییەکان لەلایـەن ئـەو کۆمەڵەیـە لەگـەڵ تیپـی سـیرواندا پێشکەشـکراوە، لـەدوای ڕاپەڕینیشـەوە بەرهەمـە شـانۆییەکان لەکـەلار فـۆرمو شـێوازی نوێـی بەخۆیـەوە بینـی، بەرهەمـی زیاتـرو هونەرمەنـدی زۆرتـر هاتونەتـە مەیدانەکـە، لەسـەرەتای گـروپ و تیپەکانـەوە تائێسـتا نزیکـەی ٢٠٠ شـانۆگەری گـەورەو منـاڵان نمایـش کـراوە.

چەندیـن  فیسـتیڤاڵی هونـەری کەرکـوك لەلایـەن وەزارەتـی ڕۆشـنبیریو یەکێتـی هونەرمەندانـی کوردسـتان لەسـاڵی ١٩٩٣ بـەدواوە سـازکراوە بەبەشـداری تیپـە شـانۆییەکانی (کـەلار، دەربەندیخـان، کفـری، چەمچەمـاڵ)

سـاڵانە لەکـەلارەوە بەرهەمێـك یـان زیاتـر لـەو فیسـتیڤاڵەدا پێشـکەش کـراوەو شـانۆکارانی کـەلار توانیویانـە خەڵاتیـش لەبـوارە جۆربەجۆرەکانـی دەرهێنـانو ئەکتـەری کـوڕو ئەکتـەری کـچو دەقو دیکـۆر بەدەسـتبهێنن.

شـانۆی قوتابخانـەکان بەشـێکی شـانۆی کـەلار پـڕ دەکاتـەوە بەبەردەوامـی بوونـی هەبـووە بەشـێوەیەك لەپـاش ڕاپەڕیـن لەکـەلار لەلایـەن بەڕێوەبەرایەتـی گشـتی پـەروەردەی گەرمیـان لەبەشـی چالاکـی هونـەری سـاڵانە فیسـتیڤاڵی هونـەری شـانۆ پێشـکەش کـراونو لەسـاڵی ٢٠١٣ شـدا لەسەردەسـتی عەبـاس عەبدولـڕەزاق بەڕێوەبەری ڕۆشـنبیریو هونـەری گەرمیـان بەشـێوەیەکی بەرفـراوان هەماهەنگیکـرا لەگـەڵ بەشـی چالاکـی بەڕێوەبەرایەتـی پـەروەردەی گەرمیـانو ١٤ بەرهەمـی شـانۆیی قوتابخانـەکان لەچوارچێـوی فیسـتیڤاڵێکدا بەنـاوی (فیسـتیڤاڵی شـانۆی پـەروەردەی کـەلار) نمایشـکرا.

بەڕێوەبەرایەتـی گشـتی پـەروەردەی گەرمیـان لەسـەر ئاسـتی کوردسـتان بەشـداری لەشـانۆی پەروەردەکانـی کوردسـتاندا هەبـووەو دەرهێنانـی شـانۆییەکانی بەشـدار بـوو لـەو فیسـتیڤاڵانەدا شـانۆکارانی کـەلار بـووەو لەگـەڵ مامۆسـتایانی هونـەر بەشـی شـانۆ.

کاروانـی شـانۆ لەکـەلار تـا ئێسـتایش درێـژەی هەیـەو نزیکـەی ٧ گـروپو تیپـی شـانۆیی مۆڵەتپێـدراو لەلایـەن ڕۆشـنبیرییەوە لەکـەلار بونیـان هەیـە وەك (کۆمەڵـەی هونەرەجوانەکانـی کـورد ـ لقـی کـەلار، تیپـی شـانۆی سـیروان، تیپـی شـانۆی منداڵانـی گەرمیـان، گروپـی هونـەری ئەسـتێرەکان، گروپـی شـانۆی بەهـرە، تیپـی شـانۆی بنکـورە، گروپـی شـانۆی بوکەڵـە) هـاوکات نوسـینگەی گەرمیانـی سـەندیکای هونەرمەندانـی کوردسـتانیش لەکـەلار هەیـە کەبـەم تیپانـەوە پێکـەوە لەکـەلار بەردەوامـن لەکارکـردن لەبـواری شـانۆدا، هونەرمەندانـی کـەلار لەڕابردوودا بەشـێکی زۆریـان لەدرامـاو زنجیـرەی تەلەفزیۆنـی لەسەرئاسـتی کوردسـتان بەشـدار بـوون لەوانـە (ڕەشـەی پۆلیـس، گەردەولـول، لاپەڕەکانـی کەرکـوك)، هەروەهـا بەشـێکیتر لـە هونەرمەندانـی کـەلار ڕویـان لـە سـینەما کـردووەو توانیویانـە لـەم ڕووە کاری خۆیـان بکـەنو جـێ پەنجەیـان دیـار بێـت و کاریـان بـۆ چەندیـن کورتـە فیلـم کـردووەو هەندێکجـار وەك ئەکتەریـش بەشـدار بـون، سـەرباری چەندیـن کەموکورتـی بنەڕەتـیو نەبونـی هـۆڵـی تایبـەت بەشـانۆکاران، بـەڵام هونـەری شـانۆ لەکـەلار ئومێـدی کاری باشـترو زۆرتـری لێدەکرێـت.



شانۆی بێ ناسنامەکان ... فۆتۆ: دلێر عەبدولڕەحمان



چالاکی شانۆی کۆن ... ئەرشیف: کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان

# هۆرەو ژیان و دەورووبەر

## م. عەبدوڵڵا حەسەن قادر

هـۆرە لـە دێـر زەمانـەوە هاوبەشـی ژیانـی خەڵـك بـووە لەگـەڵ ئاینـدا ڕەگ و ڕیشـەی تێـك ئاڵانـدووە ، ڕاسـتە ڕێـگای گوزەرانـی شـەق کـردووە ، کاریگەرانـە هـاو خـەم و هـاودەردی خەڵـك بـووە ، لـە تـەك هەمـوو بۆنـەو هـەورازو نشـێوی ڕۆژگاردا ڕۆیشـتووەو هەڵزنـاوە، ڕاسـتەوخۆ بووەتـە ئامـرازی هێورکردنـەوەی ژان و ئازارەکانـی زەمـان ، لـە ڕووداو و کارەسـاتانە ئەمانـەی خـوارەوەن :

## ١. جەنگ :

هـۆرە لـە گەرمـەی شـەڕدا ، لێـڵ تەققـەو دەسـڕێژی گوللـەدا ، لـە تەنگانـەو نەبـەردو هێرشـکردنی دوژمنـدا ، لەگـەڵ هەڵمەتـی شۆڕەسـواراندا ، جەنـگاوەری هـۆرە چـڕ بـە هەوایەکـی (حەماسـی) کاریگـەر لـە نـاو شـەڕەکەوە هـۆرەو ئازایەتـی دەخاتـە بـەر شـەڕکەران هانیـان دەدات بـە ڕۆحێکـی ئازاتـر بجەنگـن و هەڵمـەت بـەرن تـا سـەردەکەون وەك لـەم شـیعرانەدا دەردەکەوێـت کـە هـۆرە چـڕ بـە ئاوازێکـی (هەوایەکـی) تایبـەت دەیچـڕێ.

ترنگەی تەپڵێ تێ پا وە جەنگەوە

تا مەردیەل تێە دن دڵ وە تەنگەوە

ترنگەی تەپڵێ تێ لە تەرکە بانان

بییە ڕشت کوللەی زەڕین سوواران

جەنگ وگاوو شیر ، هەم شێرانی نەڕ

کەفتووە لە مەیدان لەشە وە بێ سەر

هاوکوڕەیل خاس ، جور فڕەی فەنەر

ئیسەنگەر گرتن ، چوین وە ئەو سەنگەر

دەنگ شینکەر دێت لەی هۆس و لەو هۆس

نام تەپڵە جەنگە ، پا زەڕەی ناقوس

## ٢. غەریبی

(هـۆرە) هەمیشـە لـە گـەڵ ڕەوڕەوەی ژیانـی کوردەواریـدا کەمـی نەکـردووە ، لـە زۆربـەی زۆری بۆنـە کۆمەڵایەتییـەکان و بوارەکانـی گوزەرانـی ڕۆژانـەدا بەشـداری کـردووە ، لەکۆنـەوە تـا ئەمـڕۆ هـاوڕێ و هاودەمـی مرۆڤـی کـورد بـووە ، خەمەکانـی لاواندوەتـەوە ، هەسـت و خەمـی پەنگخـواردووی دەروونیانـی بـە دەم بـاوە داوە ، ئازارەکانـی هێـور کردوونەتـەوە و بـاری گرانـی سـەر شـانییانی سـوك کـردووە ، غەریبـی و دەربـەدەری میراتـی

زەمانـەو ڕۆژگار بـووە بـۆ میللەتەکەمـان ، بۆیـە پەنایـان بردووەتـە بـەر هـۆرەو خۆمـان و دەوروبەرمانـی دووانـدوە بـە هـەوای (کەساسـی) و (غەریبـی) چـڕ وەك لـەم شـیعرانەی هـۆرەدا دەردەکەوێـت :

غەریبی شاران ، کارێ پێم کەردەن

چەپ چەپ زوڵفانم ، بای شەماڵ بەردەن

غەریبێ مەردەن ، لە دەر دەروازە

بێ گۆڕ ، بێ کفن ، بێ بەر جەنازە

غەریبی شار یەل ، پەی یەکێ خاسەن

نەزانێت ماوای خەم لە چ ڕاسەن

خەم لە لای مەردم وەکەفتە رەفتە

خەم لای دڵەکەم وەرخەروار خەفتە

خەم حەڵقەی داوە ، لە دەورە دڵم

جینایەلیتەم ، بییە منزڵم

خەم برات بمرێ ، مەرتۆ برامی

وەهەرجا مەچم ، ڕەفیقی رامی

غەریبی شاران کارێ پێم کردەن

بێزارم جەگیان، رازیم وە مەردەن

یادتان وەخەیر دوورە وڵاتان

بومە کەموتر ،با مە رای لاتان

قەریب قەریب کەن پای قەریب وەدەر

قەریب کەس نییە لە خۆم زیاتەر

غەریبی شاران کارێ پێم کردەن

چەپ چەپ زلفانم بای شەماڵ بەردەن

سیروانە شێتەی دەل ودێوانە

بێ نەجاتم دە لەی غەریبسانە

من وە ڕێواری دامە لەی ڕێیە

مەر غەریب لەبەر شارەکەس نییە

## ٣. پیری

پیریـش ڕووبـەر و پانتایەکـی تـری لـە (هـۆرە) دا داگیـر کـردووە ، هـۆرە چـڕ بـە ئـاوازی دڵ تەنـگ بـە شـیعری غەمگیـن بەسـەر خۆیـدا هەڵـدەدا کـە لـە تەمەنـی پیریـدا نەخۆشـی نەتوانایـی و ئـازار سـەری تێدەکـەن داخ کەسـەر و ئەسـەف بـۆ ئـەو ڕۆژگارە دەخـوات کـە لـە هەڕەتـی لاوێتیـدا لـە گـەڵ جوانانـدا دڵـداری کـردووە و دڵ و دڵخـوازی بـووە ، وەصـڵ و ژووانـی خۆشەویسـتەکانیان بیـر دەکەوێتـەوە ، داخ و خەفـەت بـۆ ئـەوە دەخـوات چـۆن کاروانـی ژیـان لـە هـەر مەنزڵێـك هاوڕییـەك هاوتەمەنێـك بەجـێ دەهێڵێـت و بـەرەو دووریانـی جیابوونـەوە کـۆچ دەکـەن. وێـڕای ئەوانـە باسـی کـەم دەسـتی ، گـەدای ، پیـری دەکات ، ئەمەمانـە هەمـووی لـە شـیعرانەی هـۆرەدا ڕەنگیـان داوەتـەوە .:

پیریی بەد بەخت بای ، چەتوای لە هاڵم

کەم زەڕەم کردی شکانی باڵم

کەم زەڕەمکردی فامم سەندییە

بیخ بنچینەم ، وەبن کەندییە

ئەوسا جوان بیم ، لە سەودای دڵ بیم

وەلای نازداریەل ، چوین پەڕەی گوڵبیم

پیر بیم ، کامل بیم ، پیرچووم گرتە دەس

فەلەك شیشەی عومر، جوانییم شکەست

پیریی ، کاملیی ، گاییی ، کەمدەسی ،

هەرچوار وەیەکۆ هەواڵمی پرسی

پیربیم ، کامیل بیم ، مامەوە بێکەس

چەن هاوکوڕەیل خاس ، هەموو دام لە دەس

فەلەك بەدبەخت ، یە چ کارێك کرد

جوانییەکەم چویی ، پیریی شوێنی گرد٤

## ٤.دڵداری

شیعری دڵداریش لـە (هـۆرە) دا جێگـەی تایبەتـی خـۆی هەیـە هـۆرە چـڕی عاشـق ، بـە دەنگـی بـەرزو دڵگیـر ، خۆشەویسـتەکەی دوانـدووە ، ڕازو نیـازی دڵـی خـۆی بـە گوێـدا داوە ، ژووان ، دەردە دڵ ، دووری ، خەفـەت ، مـاچ ، دەسـت بـازی ، وەسـفی بـاڵاو قـەدو قیافـەت ، زوڵـف ، خـت و خـاڵ ، سـینەو مەممـك ، تیـری برژانـگ ، لـەش و لاری گۆشـتن، بەژنـی باریـك و زەراف ، جـل و بـەرگ ، شـكار و ڕاو ئەمانـە هەمـووی بونەتـە هەوێنـی شـیعری دڵـداری لـە هـۆرەدا وەك :

ئەبرۆ پر پشتن ، چەوێل سیازاغ

ناو سینە سپی ، چیو وەفرە ئێلآخ

ئەبرو پرپشتن ، چەوێل سیا زاغ

مەنیتە سیفیك ، چەنیاویت لە باخ

پڵاچەی برژانگ ، سەوزەی باڵا بەرز

وەردان لە گیانم ، موچڕكەو تەولەرز

کافر ، بێ مروەت ، دڵ لە سەنگ خار

شەو لە ماڵەکەم ، چوی گری قەرار

خۆ من نەخۆش نیم ، خۆم زانم چەمە

کوشیاوم وەتیر ، ئەو پرتقاڵ دەمە

فیدای زوڵفەکەی قەیچی پاچت بام

گژنیژەی عەرەق جێگەی ماچت بام

جۆردز بسۆرێم ، شەو لە ماڵەکەت

سەر بنێم وەبان نەرمی باڵەکەت

فیدای خاڵەکەی بان زنجت بەم

فیدای مەممکەیل ، قومچە وقنجت بام

من دۆسێ توام ، دوس کەس نەوت

مەممکەیل قنج ومنج دەسخواردوو نەوت

فرە ئەزیزی کزەی دڵەکەم

بەو بنیش وەلام ، تاقە گوڵەکەم

# ٥.سوارچاکی

سـوارچاکی و شـۆڕە سـواری خەسـڵەتێکی دی نـاو کۆمەڵگـەی کوردەوارییـە ، لـە بۆنـەو شـای زەماوەنـدا سـواران ڕەمبـازی و تەقـەو قیـل و قـاژ و تـاو تاوینیـان کـردووە ، خەڵکانـی بەشـدار بـووی شـایی و زەماوەنـد دەبوونـە سـەیرکەریان ، بـە باڵایانـا هەڵیـان دەداو ئافەرینیـان دەکـردن زۆر یـاری سـەیرو سـەمەرەیان دەکـرد وەك لـە گەرمـەی تـاودا هەڵگرتنـەوەی بـەرد لـە زەوی ، یـان ڕانـەك لـە پێکـردن لـە سـەر پشـتی زیـن بـە دەم غاردانـەوە یـان سـوڕخواردن لـە سـەر پشـتی ئەسـپەوە ، هەڵەڕانـەوە لەژێـر سـکی ئەسـپەوە ، شـتی تریـش ، سـەرەڕای ئەمانـە لـە جەنگـدا جەنـگاوەر بـە سـواریی بەشـداری شـەڕی دەکـردوو هەڵمەتـی دەبـردە بـەر دوژمـن و دەیشـکاندن و سـەنگەری پـێ چـۆڵ دەکـردن ، بـە دیلـی دەیگرتـن و ئـاڵای سـەرکەوتنی بـەرز دەکـردەوە ، ئەمانـە هەمـووی بـە هـەوای هـۆرە دەچـڕان وەك لـەم شـیعرانەی خـوارەوەدا :

ئیمڕۆ چوم وەبار قەورەمەزاران

دووان پەی کاروان چاپوك سواران

چاپوك سواران لە مەیدان جەنگە

جەنگ گاورشێر ، بەورو پڵنگە

چاپوك سواران هان لە شوڕو شەڕ

لە ئەرزەی مەیدان سیوێڵ مەدەن جەڕ

شۆڕە سواران دەس لە دەم وەردان

چەند جەبەی قەواخ لە سەنگەر پەڕدان

شۆڕە سواران جور فەرەی فەنەر

ئی سەنگەر چۆڵکرد ، نیشت وە ئەو سەنگەر

ئیمڕۆ لە مەیدان دیمەت وە مەردی

یەك یەك سواران بەردەست مە کەردی

# وەرزش لە کەلار

شاری کەلار .... فۆتۆ : محمد صالح

## کامەران یاروەیس

ئاشـکرایه ئەمـڕۆ شـاری کـەلار، بەیەکێـك لـه شـاره گرنگەکانـی هەرێمـی کوردسـتان دادەنرێـت، لـەڕووی چالاکـی وەرزشـیو بوونـی ژێرخانـی وەرزشـیو وەرزشـکارو یاریـگاو دامـەزراوەی وەرزشـی.

گرنگـیو بوونـی ئـەم چالاکییـە وەرزشـییانه لەشـاری کـەلار دەرئەنجامـی ماندووبوونـی چەندیـن سـاڵەی وەرزشـکارانو سەرپەرشـتیارانی وەرزشـییە لەشـارەکە, هەرلەکۆنـەوە گونـدی کـەلاری کـۆن کـە بنچینـەی ئێسـتای قـەزای کـەلارە چالاکـی وەرزشـی تێـدا هەبـووەو سـەرەڕای کـەم دانیشـتووانی ئەوکاتـەی بەبـەراورد بەشـارەکانی کفـریو خانەقیـنو جەلـەولا، لەسـاڵانی شەسـتەکان تیپـی تۆپـی پێـی ئـەم گونـدە لەگـەڵ تیپەکانـی ناوچەکـە یارییـان کـردووەو ئەنجامەکانیـان مایـەی دڵخۆشـی خەڵکـی کـەلار بـووە.

بـەڵام سـەرەتای ڕاستەقینەی پەرەپێـدانو فراوانبونـی چالاکـی وەرزشـی لەمشـارە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵەکانی ١٩٧٧ بـەدواوەو هاتـنو نیشـتەجێکردنی خەڵکـی گوندەکانـی ئەوبـەری ڕوبـاری سـیروانو گوندەکانـی نزیـك شـارەکەو زۆربونـی دانیشـتوانەکەیو کردنـەوەی چەندیـن خوێندنـگاو قوتابخانـەو ئەنجامدانـی پاڵەوانێتـی سـاڵانەی قوتابخانـەکانو فیسـتیڤاڵی سـاڵانەی وەرزشـی.

ئـەم چالاکییانـە وایانکـردووە کـە لاوانو گەنجانـی شـارەکە بەشـێوەیەکی فـراوان ڕووبکەنـە وەرزش بەگشـتیو تۆپـی پـێ بەتایبەتـیو لەماوەیەکـی کورتـدا چەندیـن تیپـی میللـی تۆپـی پـێ دامـەزرا وەکـو تیپـی کـەلاری کـۆنو حەمـەی کەریـمو مەهابـادو کوردسـتانو هیـواو برایەتـیو نـەورۆزو هـاوکاری، کـە هەرتیپێـك سـەر بەگەڕەکێکـی شـارەکە بـووە.

لەوسـاڵانەوە تـا سـاڵی ١٩٩١ هەمـوو پاڵەوانێتییەکانـی ناوخـۆی ئـەم تیپانـە لەسـەر ئەرکـی خـودی تیپـەکان بـووەو بەشـێوەی کۆکردنـەوەی بڕەپارەیـەك لەهـەر تیپێـك، هەروەهـا دابینکردنـی کەرەسـتەی وەرزشـی لـە تـۆپو جلوبـەرگو یاریـگا بەهەمانشـێوە لەسـەر ئەرکـی خـودی تیپـەکانو یاریزانەکانیـان بـووە.

لەپـاش ڕاپەڕیـن یانـەی وەرزشـی شـێروانە دامـەزراو بـەدوای ئەویشـدا یانـەی وەرزشـی خانەقیـن دامـەزرا، بوونـی ئـەم دوو یانەیـە لەشـارەکە گوڕوتینێکـی زۆرتـری دا بەچالاکـی وەرزشـیو لەشـێوەی میللییـەوە گـۆڕا بـۆ دامەزراوەیـی.

ئێسـتاش لەگـەڵ فراوانبونـی شـاردا چالاکـی وەرزشـیو دامـەزراوەو تیپـی میللـی زۆر زیادیکـردووەو شـاری کـەلار سـەرچاوەیەکی زۆر گرنگـە بـۆ پەیداکردنـی وەرزشـکاری بەتوانـا تـا وای لێهاتـوو چەنـد وەرزشـکارێکی ئەمشـارە بگەنـە ئاسـتی هەڵبـژاردەی عێـراق وەکـو یاریزانـان (عەلـی تەهـا) لەبالـەو (هەڵکـەوت عـادل) لـە تۆپـی پـێ.

لەکۆتاییـدا پێویسـتە ئـەو کەسـانە لەیادنەکەیـن کـە توانییـان بەهـەوڵو ماندووبـوونو توانـای مـادی خۆیـان خزمەتـی وەرزشـی لەمشـارەدا بکـەن وەکـو (شـەهید نەجـم) ی قۆرەتـوو، خوالـێ خۆشـبوو مامۆسـتا (خەلیـل وەلـی)، کاك (ڕزگار مەشـەیی)، کاك (حەمـەی حاجـی مەحمـود)، مامۆسـتا (دڵشـاد برایەتـی)، مامۆسـتا (سـاڵەح هـاوکاری)، مامۆسـتا (ئیبراهیـم حەمـەی کەریـم)، کاك (تەلعـەت سـەعدوڵلا)، مامۆسـتا (خۆشـناو حەسـەن).

# زانکۆی گەرمیان و گەشەکردنی پێوانەیی

پ.ی. د. دارا حەمید محەمەد

زانکـۆی گەرمیـان لەئەمـڕۆدا باڵاتریـن ناوەنـدی ئەکادیمـی گەرمیانـە ، هێمایەکـی بڵنـدی شارسـتانییەتی و سـەرچاوەیەکی گرنگـی گەشـەپێدانی مرۆیـی ناوچەکەیـە ، سـەکۆی بەیەکگەیشـتنی توانا زانسـتی و ئەکادیمـی و کلتـوری و ڕۆشـنبیرییە جیاوازەکانـە کـە ئامانجیـان خزمەتکـردن و گەشـەپێدانی کۆمەڵگایـە بەگشـتی و گەرمیانـە بەتایبەتـی لەڕێـی ئاڵوگۆڕکردنـی شـارەزایی و توانـا زانسـتیی و پەروەردەییەکانیانـەوە.

بـەردی بناغـەی ئـەم زانکۆیـە لـە ٢٠١٠/٤/١٤ دا دانـرا ، لـە ٢٠١١ بەفەرمـی وەك ناوەندێکـی ئەکادیمـی کرایـەوە و دەسـتەی سـەرۆکایەتییەکەی دەسـت بەکاربـوون ، سـەرەتا و بناغـەی ئـەم زانکۆیـە بـە کۆلێجـی پـەروەردە دەسـتیپێکرد ، کـە لـە ٢٠٠٤ لەکـەلار کرایـەوە، دواتـر و لـە ٢٠٠٥ کۆلێجـی ئادابـی خانەقیـن کرایـەوە، هـەردوو کۆلێجیـش سـەر بـە زانکـۆی سـلێمانی بـوون ، لـە سـاڵانی (٢٠٠٧ ـ ٢٠٠٨) کۆلێجـی پـەروەردەی بنـەڕەت لـە کـەلار و لـە (٢٠٠٨ ـ ٢٠٠٩) کۆلێجـی وەرزش لـە خانەقیـن کرانـەوە ، هـەر لـە ٢٠١١ دا سـەرجەم ئـەو کۆلێجانـە خرانـە سـەر زانکـۆی گەرمیـان .

زانکـۆی گەرمیـان لەماوەیەکـی کەمـدا گەشـەکردنێکی پێوانەیـی و بەرچـاوی بەخـۆوە بینـی، هـەر لـە کردنـەوەی کۆلێـج و بەشـی زانسـتی نـوێ، کردنـەوەی تاقیگـە و بەردەستخسـتنی ئامێـری پێشـکەوتوو بـۆ تاقیگـەکان کـە لەگـەڵ ڕەوتـی زانسـت و تەکنۆلۆژیـای پێشـکەوتوی سـەردەمدا هاوتەریـب بـن، هەروەهـا دروسـتکردنی باڵەخانەی خوێنـدن و بەشـە ناوخۆییـەکان، دابینکردنـی سـتافی پسـپۆڕ بـۆ بەشـەکان و کردنـەوەی خوێندنـی بـاڵا (ماسـتەرو دکتـۆرا) لـە زۆرێـك لەبەشـەکان و ناردنـی ژمارەیـەك خوێنـدکار بەپێـی بەرنامـەی تواناسـازی بـۆ تەواوکردنـی خوێنـدن لـە وڵاتانـی ئەوروپـا و ئەمریـکا ... تـد، دیـارە ئـەم هەنگاوانـە بەژێرخانـی گرنگـی بونیـادی زانسـتی و ئەکادیمـی دادەنرێـت، جێـی خۆیەتـی لێرەشـەوە ئامـاژە بەڕۆڵـی دەسـتەی سـەرۆکایەتی زانکـۆی گەرمیـان و بەشـێك لەڕاگرایەتـی و بەشـە زانسـتییەکان بکەیـن لەگەشـەکردن و بونیادنانـی ئـەم زانکۆیـە، کـە بەبـەراورد لەگـەڵ تەمەنـی کەمـی شـەش سـاڵیدا بـەڵام قۆناغـی بـاش و گرنگـی بڕیـوە ، لەبەجێهێنانـی ئەرکـە ئەکادیمـی و زانسـتی و پەروەردەییەکانیـدا و پێگەیاندنـی کادری پسـپۆڕ لەهەڵگرانـی بڕوانامـەی بەکالۆریـۆس و ماسـتەر و دکتـۆرا.

ئەرکـی سـەرەکی زانکـۆ شانبەشـانی ئەرکـە زانسـتی و ئەکادیمییەکـەی هەنگاونانـە بـۆ بەدیهێنانـی پێویسـتییەکانی کۆمەڵگـە، لـەم ڕووەوە زانکـۆی گەرمیـان لەسـەرەتای دامەزراندنییـەوە ڕۆڵـی بەرچـاوی هەبـووە لەبـرەودان بـە سـەرجەم کایـە ئابـووری و ڕۆشـنبیری و مەعریفـی و کۆمەڵایەتییەکانـدا لـە گەرمیـان، ئەمـەش لەڕێـی ڕەخسـاندنی هەلیـکارو سـازدانی چەندیـن کۆنفرانسـی زانسـتی و دەیـان وۆرکشـۆپ و فەراهەمکردنـی هەماهەنگـی لەگـەڵ دامـودەزگا حکومـی و ناوەندەکانـی ڕۆشـنبیری و ڕێکخراوەکانـی کۆمەڵـی مەدەنـی لەگەرمیـان بەمەبەسـت و ئامانجـی زیاتـر خزمەتکـردن بـە ناوچەکـە.

لەئێستادا زانکۆی گەرمیان (٩) کۆلێج (پەروەردە، پەروەردەی بنەڕەت، زانست، ئەندازیاری، یاسا، زمان و زانستە مرۆڤایەتییەکان، وەرزش، کشتوکاڵ) و زیاتر لە (٢٧) بەشی زانستی بەیانیان و ئێواران، سەدان مامۆستا لەهەڵگرانی بڕوانامەی دکتۆرا و ماستەر و سەدان فەرمانبەر و هەزاران خوێندکار لەخۆدەگرێت ، هەر بۆیە بووە بە جێی ئومێدی گەرمیانییەکان و چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێت لە داهاتوودا ڕۆڵی زیاتری هەبێت لە گەشەپێدانی ناوچەکە و وابەستەبوونی بەبازاری کارو پێگەیاندنی کادرو پسپۆڕی پێویست لەکایە جیاوازەکانی وەك ئابوری، زانستی، پەروەردەیی، سیاسی، کۆمەڵایەتی ... تد.




زانکۆی گەرمیان... فۆتۆ : دلێر عەبدولرەحمان



زانکۆی گەرمیان... فۆتۆ : دلێرعەبدولرەحمان



زانکۆی گەرمیان... فۆتۆ :دلێر عەبدولرەحمان



زانکۆی گەرمیان... فۆتۆ :دلێر عەبدولرەحمان

# کەلار و خەنەبەندانی١٩٨٤

## دیار ڕەشید

شـاری کـەلار هەرچەنـدە لـە رووی کارگێرییـەوە وەك قـەزا مێژوویەکـی دووری نیـە وەلـێ بەحوکمـی هەلکەوتـەی جوگرافێکـە ی کـە بۆتـە ناوەندێکـی گـەورەی ئاوەدانـی لـە دەڤـەری گەرمیـان و سـنوری هەرێمـی کوردسـتان لـە گـەڵ دەولەتـی عێـراق دەکرێـت بڵێـن لـە زۆر کایـەی ژیـان و ژیارییـەوە باڵاترلـە بـەژن و تەمەنـی خـۆی هەنـگاوی پێشـەنگی هاویشـتووە , هـەر ئەمەشـە کـەوای کـردووە چەردەیـەك بەسـەرهات و حیکایەتـی جۆراوجـۆری لـە دوو توێـدا هەبـێ , کـە لـە هەموویـان زەقتریـش سەرکوزشـتە و چیرۆکـی گیانبـازی رۆڵەکانێتـی لـە داسـتانە نەتەوەییەکانـدا , بـە چەشـنێك کـە بەشـێکی زۆری لاپەرەکانـی مێـژووی بزاوتـە نەتەوەیـی کـورد شـاهیدی ئـەوەن کـە رۆڵەکانـی ئـەم شـارە بـە دێهاتەکانیـەوە کارەکتـەری سـەرەکی داسـتان و نەبەردێکانـن ,لـە هەگبـەی ئەرشـیفی رووداوەکانـی شـاری کـەلاردا دەگەڕێنـەوە بـۆ ٣٣ سـاڵ پێـش ئێسـتا , وردتـر... لەسـەرەتای سـاڵی ١٩٨٤ دا کاتێـك سـوپای عێـراق رۆژ دوای ڕۆژ لەبەرامبـەر سـوپای ئێرانـدا توشـی شکسـت دەبـوو، لەولاشـەوە لەگـەڵ یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتانو پارتـی دیموکراتـی کوردسـتانو حزبـی شـیوعی کوردسـتانو حزبـی سۆسیالیسـت دیموکراتـی کوردسـتان لەشـەڕدابوو، بەناچـاری پەنـا دەباتـە بـەر گفتوگـۆ لەگـەڵ یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتانو لـەو سەروبەندەشـدا جەمـاوەری شـاری کـەلار بـۆ خۆشـی دەربڕیـن دەڕژێنـە سـەر شـەقامەکانو ئاهەنـگو خۆشـی دەگێـڕن، بـەڵام لەلایـەن سـوپای عێراقـەوە لـە گەڕەکـی (حەمـەی کەریـم) تەقـە لـە هاووڵاتیـان دەکرێـت و هاووڵاتیـەك بەنـاوی (جمعـە ڕۆسـتەم قـادر) شـەهید دەکرێـت.

ساڵەح هـەلاج لەبـارەی ئـەو ڕووداوەوە گوتـی «سـاڵی ١٩٨٤ دانوسـتانی نێـوان شـۆڕش و ڕژێمـی بەعـس بـوو، بەعـس کەوتـە خـۆ دزینـەوە لـە بەڵێنەکانـی ڕێککەوتنەکـەی لەگـەڵ شۆڕشـدا، سـەرکرایەتی شـۆڕش لەڕێگـەی ڕادیـۆی دەنگـی گەلـی کوردسـتانەوە داوای لـە جەمـاوەری کوردسـتان کـرد ڕاپەڕینـی ئاشـتییانە بکـەم بـۆ پشـتگیری لـە داواکانـی خەڵکـی کوردسـتان، لەزۆربـەی شـارەکانی کوردسـتان ڕاپەڕیـن کـرا، ئێمـەش لەکـەلار بەرنامـەی ڕاپەڕینـمان داڕشـت، سـەرەتا لەگەڕەکـی لیـوا کۆنەکـە مـن و ئەمیـن حاجـی ڕەشـید پاڵانـیو سـمایلی مـەلا عەبـاس و ڕەحـمان خانـی و شـەهید سـەڵاحی بـرام و کۆمەڵـێ کەسـی دیکـە دەسـتمان بەڕاپەڕیـن کـرد و بـە هیدفـۆنو مسـەجەلێکەوە ڕومانکـردە گەڕەکـی ٥٠٠ سـەد ماڵەکـەو لەوێشـەوە بـۆ گەڕەکـی حەمـەی کەریـم، لـەوێ لەگـەڵ برادەرانـی ئـەو گەڕەکـە تێکـەڵ بویـن و تادەهـات ئاپـۆرای جەمـاوەر زۆرتـر دەبـوو ئـەو شـەوە تادرەنگانـی شـەو گەنجانـی شـار دروشـمیان دەوتـەوە».

گوتیشـی «بـۆ ڕۆژی دواتـر پارێـزگاری ئەوکاتـەی سـلێمانی کـە شـێخ جەعفـەر بـوو بەهێزێکـی دڕنـدەوە کـە زۆرینەیـان هێـزە تایبەتەکـەی سـەددام حسـێن بـوون هاتـن بـۆ کـەلار بـۆ چاوشـکاندنی جەمـاوەر، بـەڵام گەرمیانییـەکان وەك پێشـەی نەبەردییـان لەسـەر شـەقامی کـەلار ـ دەربەندیخـان و لەبەرامبـەر گەڕەکـی حەمـەی کەریـم بەبـەردو دار پەلامـاری هێزەکەیانـداو ئەوانیـش دەسـتیان کـرد بەتەقەکـردن بەنـاو خەڵکیـداو لـە ئەنجامـدا گەنجێکـی خوێنگـەرم بەنـاوی جمعـە ڕۆسـتەم قـادر شـەهید بـوو چەنـد کەسـێکی دیکـەش بریندارب‌ـوون».

هـەلاج ڕونیکـردەوە «بـۆ ڕۆژی دواتـر تەرمـی شـەهید جمعـە لـە ڕێوڕەسـمێکی شایسـتەو جەماوەریـدا لـە گۆڕسـتانی بەرلـووت بەخـاك سـپێردراو بەوتـارو شـیعرو دروشـمی کوردایەتـی، لەوکاتـەدا برایـەك هاتـە لامـەوە وتـی ئیسـتخباراتی کـەلار لـە بازگەکـە هێزێکـی زۆریـان کۆکردوەتـەوەو منیـش بـە ئاسـۆی مەحمـود بەگـی جافـم گـوت کـە ئـەوکات ئەندامـی ئەنجومەنـی عێـراق بـوو وتـی هیـچ مەترسـن مـن خـۆم پێشـتان دەکـەوم».

«لـەم ئـان و ساتەدا خـوا لێخۆشـبوو ئاواتـی عەبدولغەفـور کـە سـەرۆکی لیژنـەی تەنسـیقی سـلێمانی بـوو، ئـەوکات ئەندامی ناوەنـدی کۆمەڵـەی ڕەنجدەرانـی کوردسـتان بـوو هـات بـۆ ئامادەبوونـی بەخـاك سـپاردنی تەرمـی شـەهید جمعـە، منـی بینـی بانگـی کـردم وتـی هـەر ئێسـتا بـڕۆ بەنـاوی تەنسـیقەوە هەرچـی پێشـمەرگەو دەسـتەیەکی پێشـمەرگە لـە شـارەکانی

کـەلارو کفـری هەیـە ئـاگادار بکـەرەوە بـا لەشـار دەربچـن، منیـش لەگـەڵ خوالێخۆشـبوو مـام تایـەر عەزیـز شاسـوار خاڵـۆی شـەهید مـەلا ئەحمـەد کـەلاریو مستەفای سـەید سـلێمانو سـەید محەمـەد سـەید سـلێمانو مـلازم لوئـەی کـە ئەفسـەری ئیسـتخبارات بـوو لەکـەلارەوە بـەرەو کفری کەوتینـە ڕێو لەسـەر ڕێگاکـە ڕەبایـەی سـەربازی بەمبـەرو ئەوبـەری شـەقامەکەدا زۆربـوو مـلازم لوئـەی ئـاگاداری دەرکردنـەوە کـە لیژنـەی تەنسـیقین و کارمـان هەیـە».

مامۆسـتا عەزیـز عەبـاس بـڕوای وایـە «حکومەتـی بەعـس بەئەنجامدانـی دانوسـتان لەگـەڵ لایەنـە کوردییەکان سـێ ئامانجی هەبـوو لەلایـەك یەکێتـی لـە ئێـران دابـڕی کـە هاوپەیمانـی بەهێـزی بـوو بۆئـەوەی سـەرقاڵی شـەڕنەبێت لەگەڵیـداو لەلایەکـی تریشـەوە دووبەرەکـی خسـتە نـاو حزبـە کوردییەکانـەوە چونکـە تاکلایەنـە لەگـەڵ یەکێتـی گفتوگـۆی کـردو بەوهۆیـەوە شـەڕوپێکدادان لەنێـوان یەکێتـیو حزبـی سۆسیالیسـتدا دروسـتبوو ژمارەیـەك هاووڵاتـی لەهـەردوولا کـوژران، هەروەهـا لـەم گفتوگۆیـە ئەنـدامو لایەنگرانـی یەکێتـی بـۆ ئاشـکرابوو کاتێـك هاتنـە سـەر شـەقام بـۆ خۆشـی دەربڕیـن».

عەبـاس ئەوەشـی گـوت «کۆتایـی سـاڵی ١٩٨٣ و سـەرەتای ١٩٨٤ ڕۆژ دوای ڕۆژ باسـی گفتوگـۆ گەرمـتر دەبـوو بۆیـە شـەوی ١٩٨٤/١/١٧ خەڵـكو جەمـاوەری شـاری کـەلار ڕژانـە سـەر شـەقام و تاکـو درەنگـی شـەو لەسـەر شـەقام ئاهەنـگ و خۆشـییان گێـڕا».

ڕەحـمان خانـی کـە لـە خۆپیشـاندانەکەدا بەشـداربووە ڕونیکـردەوە «ئەوانـەی لەقۆڵـی لیواکـەوە خۆپیشـاندنیان دەسـتپێکرد بریتـی بـون لـە شـەهید ئەمیـن حاجـی ڕەشـید پاڵانـی و ئیسـماعیلی سـەید عەباسـی گەرمکـیو شـەهید سـەڵاح هـەلاجو مـن و چەنـد گەنجێکـی تـر، بەکۆمەڵـێ دروشـمی کۆمەڵـەوە لەبەرامبـەر ئیـدارەی گەرمیانـی ئێسـتا بـەرەو بـازاڕ بەڕێکەوتین بـەدەم وتنـەوەی دروشـمەوەو تادەهـات خەڵکـی زیاتـر دەهاتنـە نـاو مەسـیرەکەوە، ئیـتر لـە هەمـوو قۆڵەکانـەوە بـە سـەماعەو سـەیارە سـوڕانەوە بەسـەر شـەقامە سـەرکییەکاندا دەسـتی پێکـردو شـار بەتـەواوی خرۆشـا، هەرچەنـدە هیـچ ئەمرێـك نەبـوو بـۆ خـۆ دەرخسـتن بۆئـەوەی ڕێکخسـتنەکان کەشـف نەبـن بـەڵام خەڵـك خـۆی پـێ نەدەگیـراو دەڕژانـە سـەر شـەقامەکان».

ڕەحیـم محەمـەد نـاسراو بـە ئەبـو چۆمـان وەك بەشـداربوویەکی خۆپیشـاندانەکە ئاماژەی بـەوەدا «دروشـەکانمان لەوکاتـەدا بریتـی بـون لـە (چیتـان دەوێ ئـەی کـوردان سـە ربـە خۆیـی کوردسـتان ... کێتـان دەوێ ئـەی کـوردان مـام جـە لال و نـە وشـیروان ... بـە هێـزی مامـە ڕیشـە جـاش دەردێنیـن لـە ریشـە... ئێمـە نـەوەی مارکسـین لـە سـێدارە ناترسـین).

ئـەم گێرانەوەیـە دەرخـەری ئـەو راسـتی یـە تاڵەیـە کـە خواسـتە نەتەوەیـی و نیشـتیمانییەکانی کـورد لـە هـەر سـوچ و کەلەبەرێکـی ئـەم جیهانـەدا زۆرجـاران خەنەبەندانەکانـی لـە خوێنـدا ژەنـراون لەلایـەن ناحەزانـەوە ، وەلـێ روحـی کۆڵنـەدان هەمیشـە دڕنـی بـە شـەوە زەنگـی تاریکـی داداوە و دوژمنـی لـە گێـژاوی پلانـە نەگریسـەکانیدا بـێ هـوودە هێشـتۆتەوە .






**شەهید جمعە رۆستەم قادر**

ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی مەحمود قەجەر لە دایکبووە

لە ١٩٨٤/١/١٧ لە خۆپیشاندانەکەی گەڕەکی حەمەی کەریم (سەرکەوتن)

لەلایەن جەللادەکانی حزبی بەعسەوە شەهیدکرا.

# گۆڕستانی منداڵانی کەلار
# «مێژوەکەی بۆ ساڵانی پەنجاکان دەگەڕێتەوە»

دلێر عەبدولڕەحمان

مردنی یەك بەدوای یەکی منداڵەکانی خێزانێکی دانیشتوی شاری کەلار، دەبێتە بناغەی دروستبونی گۆڕستانێکی تایبەت بەمنداڵان لەساڵانی پەنجاکانداو لەئێستاشدا گۆڕی زیاتر لە ٢٠٠ منداڵی تێدایە کەنزیکەی ١٥ منداڵیان لەبنەماڵەیەکن، توێژەرێکی دەروونی ئاماژە بەوەدەدات کەبونی گۆڕستان لەناو گەڕەکەکانی شاردا دەبێتە هۆی دروست بونی کاریگەری نەرێنی لەسەر دەرونی مرۆڤ، مامۆستایەکی ئایینیش جەخت لەوەدەکاتەوە گەر پرۆژەیەکی گرنگی زیندووەکان پێویستی بەگواستنەوەی گۆڕستانێك هەبێت لەڕوی شەرعییەوە ئاساییە گۆڕەکان بگوێزرێنەوەو سەرۆکی شارەوانیەکانی گەرمیانیش رایدەگەیەنێ رێگە نادەن ئەو گۆڕستانە لەوەزیاتر فراوانتر بکرێ.

نامیق محیەدین محەمەد کەپیشەی مامۆستایەو باوکی یەکێك لەو منداڵانەیە لەو گۆڕستانەدا نێژراوە بۆ (یادی کەلار) گوتی «مێژووی گۆڕستانەکە بۆ ساڵانی پەنجاکان دەگەڕێتەوەو یەکەمین منداڵیش کەلەو گۆڕستانەدا نێژراوە برای من بوە، ئەوەش دوای ئەوە هاتوە کەباوکم بەهۆی نەخۆشیەوە منداڵی بۆ نەماوەو لەو سەردەمەشدا بەهۆی دوری لەگۆڕستانی شارەکەو نەبونی ئۆتۆمبێل‌و سەرقاڵی بەپیشەی کشتوکاڵو ئاژەڵداریەو نەیتوانیوە تەرمی منداڵەکانی بباتە گۆڕستانی شار».

هەروەها گوتی «باوکم لەو سەردەمەدا پرسیاری لەمامۆستایەکی ئایینی کردوە ئەویش پێی ڕاگەیاندوە کەدەتوانێ تەرمی منداڵەکانی لەنزیك ماڵی خۆیدا بنێژێت‌و ئەوەش بۆتە بناغەی دروستبونی ئەو گۆڕستانە».

ئەو مامۆستایە ڕونیشیکردەوە «جیا لەتەرمی منداڵێکی خۆم نزیکەی ١٥ تەرمی منداڵی بنەماڵەکەمان لەو گۆڕستاندایەو لەئێستاشدا بەبەردەوامی تەرمی منداڵی دیکەی بۆ دێنن‌و لەفراوانبوندایە».

عەباس مەحمود توێژەری کۆمەڵایەتی بۆ (یادی کەلار) گوتی «بونی گۆڕستان‌و ئەو شوێنانەی ڕەشبینی‌و ئومێد بەمرۆڤ نابەخشن‌و توشی ڕەشبینی دەکەن باشترە لەشوێنی هاتوچۆکردنی مرۆڤ‌و شوێنە گشتیەکان بەدووربن، چونکە ڕۆژانە مرۆڤ پێویستی بەوەیە چاوی بەو شوێنانە بکەوێت ئاسودەیی‌و خۆشەویستی‌و میهرەبانی پێدەبەخشن».

گوتیشی «بوونی گۆڕستان لەگەڕەکەکانی شارو لەنزیك ماڵەکان کاریگەری نەرێنی لەسەر دەرونی مرۆڤەکان دادەنێ‌و بەتایبەتیش لەسەر ئەو کەسانەی نەخۆشی دەروونییان هەیەو زۆرجار دوچاری خەمۆکی‌و بێتاقەتی‌و دڵەڕاوکێیان دەکات‌و گوماندەکرێ پەنا بۆ خۆ کوشتن ببەن».

گۆڕستانی پەپولەکان لەشوێنێك هەڵکەوتوە کەبەتەنیشتیەوە قوتابخانەیەك دروستکراوەو ڕۆژانە منداڵان بەتەنیشت ئەو گۆڕستانەدا دەچنە قوتابخانە، ئەو توێژەرە دەرونیە لەوبارەیەوە دەڵێ «گۆڕستان دەبێت لەشوێنێکی دوورە دەست بێت بۆئەوەی منداڵ نەیبینێ، بەڵام بەداخەوە لەئێستادا لەکاتی مەراسیمی

ناشـتنی تەرمەکانیشـدا منـداڵ دەبیـنرێ ئـەوەش حاڵەتێکـی دەروونـی خـراپ بـۆ ئـەو منداڵـە دروسـتدەکات».

مامۆستا کامـەران عەلـی یەکێك لەمامۆسـتایانی سـەرای ئـازادی شـاری سلێمانی لەبـارەی دروسـتکردنی گۆڕسـتان لەنـاو شـارەکاندا جەختیکـردەوە «نەلـەڕوی شـەرعەوەو نەلـەڕوی مەنتیـق و زەوقـی مرۆڤیشـەوە دروسـت نیـە گۆڕسـتان لەنـاو گەڕەکەکانـی شـاردا دروسـتبکرێ، ئـەو گۆڕستانانەشـی ئێسـتا لەنـاو شـارەکاندان پێشـتر لەپـەڕی شـار بـون و پێشـبینی فراوانبونـی شـار نەکـراوە بۆیـە لەگـەڵ زۆربونـی دانیشـتوانی و فراوانبونـی گەڕەکەکانـدا کەوتونەتـە نـاو شـارەکانەوە».

بەگوتـەی ئـەو مامۆسـتا ئایینیـە «ئەگـەر پرۆژەیەکـی خزمەتگـوزاری زینـدووەکان لەسـەر گۆڕسـتانێك پەکـی کەوتبێ ئـەوا لـەڕوی شـەرعەوە ئاسـاییە گۆڕسـتانەکە بەسەرپەرشـتی لیژنەیـەك لەمامۆسـتایانی ئایینـی و دانیشـتوانی ئـەو گەڕەکانـەی نزیـك گۆڕسـتانەکانن بگوێزرێتـەوە بـۆ شـوێنێکی دیکـە کەگونجـاو بێـت، بەپێچەوانەشـەوە درووسـت نیـە بەبونـی پاسـاوی ئـەوەی نابێـت گۆڕسـتان لەنـاو شـاردا بێـت گۆڕسـتانەکان بگوێزرێنـەوە».

جـەواد وادی سـەعید سـەرۆکی شـارەوانیەکانی گەرمیـان لەبـارەی گۆڕسـتانەکەوە رونیکـردەوە «گۆڕسـتان بەشـێکە لەشـارەوانی، لەوچوارچێوەیەشـدا ئێمـە دیراسـەی ئـەو گۆڕسـتانە دەکەیـن و سـیاجی بۆدەکەیـن و ڕێگـە نادەیـن لەوەزیاتـر فـراوان بێـت».

هەروەهـا گوتـی «پێشـتر پێشـنیارێك هەبـوە بۆئـەوەی گۆڕسـتانێك لـەدەرەوەی شـارو لەبەردەسـوور دروسـتبکرێت بـەڵام بەهـۆی بونـی زانکـۆی گەرمیـان لـەو شـوێنە ڕەتکراوەتـەوە، لەئێسـتاشـدا پێشـنیارێك هەیـە گۆڕسـتانێك لەنزیـك گۆڕسـتانی دێبنـە لەشـارەدێی ڕزگاری دروسـت بکرێـت چونکـە گۆڕسـتانەکانی نـاو شـارەکە بـواری فراوانبونیـان نەمـاوە».



گۆڕستانی منداڵانی کەلار ... فۆتۆ : دلێر عەبدولرەحمان

# جۆگەی گاور

## ساڵەح هەلاج

سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٧ پـرۆژەی ئاودێـری کشـتوکاڵی بـۆ کـەلار دەرچـوو، لەلایـەن بەڕێوەبەرایەتـی ئاودێـری (ڕەی) سـلێمانی سەرپەرشـتی دەکـرا، ئەندازیارێـك بەنـاوی (عەبـاس ڕۆسـتەم) سەرپەرشـتی دەکـرد، منیـش وەکـو چاودێـری کار هـاوکاری بـووم.

پرۆژەکـە سـەرەتا لـە سـەر ڕووبـاری سـیروانەوە بەرامبـەر چـوار ڕێیانەکـەی نـاو بـازاڕی کـەلار دەسـتی پـێ دەکـرد بـەرەو شـوێنی ئێسـتای تەلەفزیۆنـی ئاینـدە ڕاسـتە و ڕاسـت بـەرەوە چەمەکـەی گردەگۆزینـە.

سـەرەتا دوو سـێ ڕۆژ بـە کاری ئیـداری فەرمانگەکەمانـەوە سـەرقاڵ بویـن، لەگرتنـی شـوێن و دامەزراندنـی کرێـکار و جێگـە و ڕێگـە بـۆ شـۆفێری شـوفڵ و گرێـدەر و حەفـارەو کـۆگا بـۆ چیمەنتـۆو ئـەو پێداویسـتیانە.

جارێکیـان کاك عەبـاس وتـی بابچیـن ڕووپێوێکـی کارەکەمـان بکەیـن تالێمانـەوە دیاربـێ نـەوەك بەربەسـت و ڕێگـری بێتـە بەرکارەکانمـان، هـەر بـە ڕاسـتی کاك عەبـاس پیاوێکـی بەئەزمـوون و شـارەزا و سـەنگینیش بـوو.

گەڕەکـی بنگـردی ئێسـتا ئـەوەی دەکەوێتـە خـوار بـازاڕەوە زەوی کشـتوکاڵی بـوو لـە نـاو پرۆژەکـەی ئێمـەدا، بەپێـی نەخشـەکەمان ڕۆیشـتین و چـوار کرێکارمـان لەگـەڵ خۆمـان بـرد، چـەن مەترێـك و خاڵێکـمان دیـاری دەکـرد، تـا گەیشـتینە سـەر چەمـی (خرەشـێت) کـە چەمێکـی وشـکە تەنهـا لەزسـتان و کاتـی بـاران ئـاوی هەیـە، لەپاینـی سـەرەوەی گردەگۆزینـەوە دەرژێتـە ڕووبـاری سـیروانەوە.

لەنـاو چەمەکـەدا ئاسـەواری هەنـدێ دیوارمـان بینـی کـە بـە قسـڵ و بـەرد درووسـتکرابوو، لـە ڕاسـتیدا مـن هیـچ زانیاریـم لـە سـەر ئـەو شـتانە نەبـوو.

پاشـان گەڕاینـەوە لـە هەنـدێ شـوێن کۆنـە جۆگـەی گـەورە مابـوو، بەپێـی زانیـاری کاك عەبـاس ئـەو ڕێڕەوەمـان هێنـا بـۆ شـوینی ئێسـتای ژینگـەی کـەلار، لەشـەقامە قیرەکـەی کـەلاری کـۆن پەڕینـەوە بـەرەوە خۆرئـاوای گەڕەکـی فەرمانبـەران، ئـەوکات نـە گەڕەکـی فەرمانبـەران هەبـوو نەماڵەکانـی پـاڵ ئێسـتای یاریـگای یانـەی شـێروانە، ئەوکاتە لەونـاوە جۆگەکـە تـەواو دیـار بـوو هەتـا سـەر چەمـی حەمـەی کەریـم خەڵکـی پێیـان دەوت جۆگـەی گاور.

لەنــاو چەمەکــە ســیفۆنێکی ترمــان بینــی بــەڵام لافــاو کاریگــەری خراپــی لــە ســەر کردبــوو. گەڕاینــەوە بــۆ فەرمانگەکەمــان.

کاك عەبـاس ڕۆژی شـەمە دەهـات بـۆ کـەلار و پێنـج شـەمە دوای کار دەگەڕایـەوە بـۆ سـلێمانی چونکـە خەڵکـی سـلێمانی بـوو. ئەمجارەیـان ڕۆژی چوارشـەممە گەڕایـەوە بـۆ سـلێمانی، سـەری بەڕێوەبەرایەتـی شـوێنەواری سـلێمانی دابـوو، باسـی ئـەو جۆگـە و سـیفۆنانەی بۆکردبـوون، دوای چـەن ڕۆژێـك چەنـد کەسـێکی شـارەزای بـواری شـوێنەوار لـە سـلێمانیەوە هاتـن بـۆ کـەلار، چوینـە سـەر سـیفۆنە کۆنەکـە و بـە هەمـان شـوێنی ئێمـەدا ئـەوان کەوتنـە کنـەو پشـکنین، ئەمجـارە لەشـەقامی کـەلار پەڕینـەوە بـەرەو گەڕەکـی گازینـۆ و ڕووبـاری سـیروان هەڵبـەت خەڵکـی ئـەو گەڕەکـە جـاران پێیـان دەوت گونـدی حەمـەی وەلـی، لـە ڕووبـاری سـیروان بـن کاژەکان

کونـی گـەورەی هەڵکۆڵراومـان بینـی زۆر درێـژ بـوو .

لیژنەکـە ڕاپۆرتـی خۆیـان نووسـی و گەڕانـەوە. پـاش چەنـد ڕۆژێـك ڕاپۆرتێکیـان بۆمـان نـارد کـە باسـی مێـژووی دروسـتکردنی ئـەو پرۆژەئـاوەی دەکـرد بەمجـۆرە.

جۆگـەی گاور, پرۆژەیەکـی ئاودێـری بـووە، بنەوانەکـەی لـە بـن تەلانەکانـی خـوار بەردەسـوورەوە بـووە، بەنـاو ئـەو کوونانـەدا ئاوەکەیـان ڕاکێشـاوە، ئەوجۆگـە لـە سـەردەمی ساسـانیەکاندا کـراوە, نزیکـەی ٢٥٠٠ سـاڵ پێـش ئێسـتا دروسـتکراوە لەدەشـتی شـێروانە. کـە بـەدوو سـیفۆنی ژێـر ئـاوی, ئاویـان گواسـتۆتەوە بـۆ زەویـە کشـتوکاڵییەکانی خـوارووی کـەلار, سـیفۆنێکیان کەوتۆتـە سـەرووی گەڕەکـی حەمـەی کەریـم, ئەویتریـان لـە سـەرچەمی گردەگۆزێنە. ئـەم پـرۆژە ئـاوە کەوتۆتـە نێـوان سـەدان دۆنـم زەوی کشـتوکاڵی, پـاش هاتنـی سـوپای ئیسـلام بـۆ ئـەم ناوچەیـە ئـەم جۆگەیـش وەك سـەدان شـوێنەوار و گۆرسـتانی کوردسـتان دەسـتەواژەی (گاور) ی بـە سـەردا سـەپێنراوە.

پاشـتر و دوای چەندیـن سـاڵی لقێکـی تـری و جۆگـەی کارێـزی ژێـر زەوی دۆزراوەتـەوە کـە بـۆ ئاودێـری یـان هـەر مەبەسـتێکی تـر بـەرەو گردەگۆزینـە ئاویـان گواسـتۆتەوە، بەپێـی قوڵایـی شـەش مەتـر لـە ژێـر خاکـدا بـووە.

ئەوەیـان سـەیر بـوو سـیفۆنەکەی ئێمەیـش کـە لەچەمـی گردەگۆزینـە دروسـتمان دەکـرد بـە هەمـان شـێوە و ئەنـدازەی ئـەو سـیفۆنە بـوو کـە ساسـانییەکان پێـش زیاتـر لـە ٢٥٠٠ دروسـتکرابوو.












جۆگەی گاوری ... فۆتۆ: محمد عەلی

# قوتابخانەی ئەڵوەن و حیکایەتی حەشاردانی دوو پێشمەرگە

## دیار ڕەشید

گـەر باسـی جێدەسـتو شـوێن پـێو حەشـارگەکانی شۆڕشـگێرانی میللەتەکەمـان بکەیـن لەپارچـە جیاجیاکانـی کوردسـتان، خۆمـان لەبـەردەم ئەرکێکـی قـورسو گـران دەبینینـەوەو پێدەچێـت بسـت بەبسـتی دەشـتو شـاخو ئەشـکەوتەکانی کوردسـتان بپێویـنو بـۆ هـەر بسـتێك چەندیـن چیـرۆكو داسـتانی قارەمانـی مێـژوی بەرخـودان بنوسـینەوە کەبـەوەش ڕەنگـە نەتوانیـن وێنایەکـی ڕاسـتەقینەی ئـەو ڕۆژگارە سـەختانەی بزاڤـی ڕزگاریخـوازی میللەتەکەمـان نیشـانی نـەوەی ئاینـدە بدەیـن، ئـەوەی لێرە مەبەسـتمانە گێڕانـەوە چیرۆکێکـی ڕاسـتەقینەی خەباتی ڕۆژە دژوارەکانـی میللەتەکەمانـە لەسـنوری گەرمیـانو وردتـر شـاری کـەلار لەپـاش پرۆسـەی ئەنفال کەهەوڵێکـی شکسـتخواردوی جینۆسـایدکردنی میللەتەکەمـان بـوو لەلایـەن ڕژێمـی پێشـوی عێـراق لەسـاڵی ١٩٨٨ کەئـەوکات هێشـتا فرمێسـکی دایکانـی کـورد بـۆ شـەهیدانی کیمیابارانکردنـی هەڵەبجـە وشـك نەبووبـوو.

لـەو ڕۆژگارەدا خـاكو خەڵکـی باشـوری کوردسـتان لەوپـەڕی بێهێـزیو نەهامەتیـدا بـوو هێـزی پێشـمەرگە بەهـۆی ڕوخاندنـی گونـدەکانو بێسەروشـوێنکردنی خەڵکەکـەی کەجێـی حەوانـەوەو پاڵپشـتی سـەرەکی هێـزی پێشـمەرگە بـون توشـی ئاوارەیـی ئێـرانو پەرتەوازەیـیو لانـەوازی بوبـون. بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەم دۆخـەو خـۆ حەشـاردانو دەربازبـون لەسـەربازگەو زاڵگەکانـی ڕژێمـی بەعسـی ئـەوکات کەسـەراپای کوردسـتانی تەنیبـوو، سـەرکردایەتی شـۆڕش بەنهێنـی ڕێکخسـتنەکانی ناوشـاری بەکاردەهێنـا کەنهێنـی پارێـزو بەئەمـەك بـون بەرامبـەر بەخـاكو نیشـتمانو هەرگیـز لەڕاپەڕاندنـی چالاکیەکانیانـدا سڵیان لەمـردن نەدەکـردەوە.

چیرۆکەکـە لێـرەوە دەسـتپێدەکات (محەمـەد مەحمـود ئەمیـن ڕۆسـتەم) نـاسراو بـە (خەلیفـە) کەیەکەمیـن کارگـوزاری قوتابخانـەی (الحریـە) ی جـارانو (ئەڵـوەن) ی بنەڕەتـی ئێسـتایە، ئـەوکات سـەر بەڕێکخسـتنەکانی ناوشـاری یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان بـو، وەك خـۆی دەیگێڕێتـەوە لەگـەڵ چەنـد برادەرێکـی دیکـەدا پەیوەندیـمان بـە (نەسرەدیـن ئەحمـەد) ەوە بـو لەبەرنهێنـی پارێـزیو دوور لەچـاوی جـاشو سیخوڕەکانی بەعس زۆرجـار لـەدوری چەنـد مەترێکـەوە گفتوگۆمـان لەگـەڵ یەکـتر دەکـرد یـان بەئاماژە، ڕۆژێـك (سـەید ئەحمـەد) کەئـەوکات پاسـەوانی قوتابخانـە بـو هەواڵـی بۆنـاردم کـەدوو پێشـمەرگە دەنێـرێ بـۆ لام خزمەتیـان بکـەم تـا هەلێکیـان بـۆ دەڕەخسـێتو لەڕوبـاری سیروان دەپەڕنـەوەو دەگەنـە سنوری ئێـران، بـۆ ناسینەوەشـیان ناونیشـانی تـەواوی پێشـمەرگەکانی پێـدامو منیـش بـۆ ڕاپەڕاندنـی ئـەم ئەرکـە بـێ سـڵەمینەوە ڕازی بـومو خـۆم بـۆ ئامادەکرد.

کات هاوینـی سـاڵی ١٩٨٩ بـو تادرەنگانـی شـەو خەڵـك بەدەرەوەبـون، پێشـوەخت بـۆ جێبەجێکردنـی ئەرکەکـەم ئامادەکاریـم کردبـوو لەئامادەکردنـی خـواردنو جێگەی حەوانـەوەو تەنانەت پلانی هەڵاتنیشـیانم دانابـوو لەحاڵەتی ئاشـکرابونیاندا، ئەوشـەوە هـەر لەپـاش نانخواردنـی ئێـوارە کەوتمـە دەرودەشـتکردنو چاودێـری کۆڵانەکـەم دەکـرد، کاتژمێـر ١١ ی ئـەو شـەوە دوو پێشـمەرگەکە هاتـنو پێـش گەشـتنمان بەیـەك لـەدوری چـوار مەتـرەوە سـڵاوم لێکـردنو پـاش وەڵامدانـەوە بەپێـی ئـەو نهێنیانـەی پێـم درابـوو ناسـینمەوەو بردمـەوە بـۆ ماڵـەوەو خزمەتـم کـردن کەیەکێکیـان نـاوی (کامـەران) بـو، هەریەکەیـان چەکێکـی کلاشـینکۆفی حەفتـاو پێنجـیو دوو ڕمانـەو نزیکـەی ٥٠٠ فیشـەکیان پێبـوو، هەمـوو چـەكو تەقەمەنیەکانـم لـێ وەرگرتـنو خسـتنمە نێـو گوێنیەکـی بەتاڵـی برنجـی تایلەنـدی ئـەوکاتو درەنگانێکـی ئـەو شـەوە لەنێـو ئـەو داڵێیـەدا کەلەپشـتەوەی پۆلەکانـەوە کردبـوم شـاردمنەوە، ئـەو شـەوە هیـچ ڕوی نـەدا دیـار بـو پێشـمەرگەکان زۆر مانـدو بوبـون پـاش دڵنیابـون بەئارامـیو بێخـەم نوسـتن

بـۆ رۆژی دواتـرو لەدەوروبـەری کاتـی چێشـت لێنانـدا (نەسرەدیـن ئەحمـەد) لـەدوری چەنـد مەترێکـەوە پێـی ڕاگەیانـدم کەسـبەی سـەربازەکانی حکومەتـی عێراقـی لەهەرسـێ قۆڵـی دووزو زەڕایـەنو جەلـەولاوە دێـن بـۆ پشـکنینی شـارو بەپێـی زانیاریـەکان هـەر ماڵێـك ٧ کەسـی بـۆ پشـکنین بەردەکەوێـت، بەبیسـتنی ئـەم هەواڵـە لەبەرخۆمـەوە دەمگـوت خـوا لەحکومەتـی بەعـس گەورەتـرە، خـوا یاربـێ (خەلیفـە) تەکبیرێکـی بـۆ دەکات.

بۆیـە پـاش نانـی نیـوەڕۆ پێشـمەرگەکانم لەهەواڵەکـە ئاگادارکـردەوەو کەوتمـە تەکبیرکـردن تاگەشـتمە ئـەو قەناعەتـەی کەلـەژوری کـۆگای کتێبـی قوتابخانەکـەدا حەشـاریان دەم کەدەزگایەکـی حکومیـەو جێـی گومـان نیـە، پـاش نیـوەڕۆی ئـەو رۆژە کەوتمـەڕێ بـۆلای مامۆسـتا حەسـەن کەئـەوکات ماڵیـان لەگەڕەکـی بنگـرد بـو بـۆ وەرگرتنـی کلیلـی کـۆگای کتێبـەکانو بەهـەر فێڵێـك بێـت لێـم وەرگـرتو نهێنـی کارەکـەم بـۆ ئاشـکرا نەکـرد، دواتـر هـەر سـەرلەئێوارە خـواردنو ئـاوی ساردو پانکەیەکـی زەویـم بـردە ژورەکـەو ئامادەمکـرد تـاکات گەیشـتە کاتژمێـر ١٢ ی شـەو، ئیـتر دوو پێشـمەرگەکەم ئاگادارکردەوە کەلەحاڵەتـی ئاشـکرابونیاندا دەسـت لەسـەربازەکانی رژێـم نەپارێـزنو لەکاتـی بەدیـل گرتنیانـدا کەئەگەرێکـی چاوەڕوان نەکراوبووهیـچ وشـەیەك نەدرکێـنو ئەوانیـش جوامێرانـە بەڵێنیانـدا کەتامردنیـش نهێنـی نەدرکێنـن.

بەمـەش یـاوەری هـەردوو پێشـمەرگەکەم کـرد بـۆ شـوێنی مەبەسـتو دەرگام لەسـەر داخسـتن، ئـەو شـەوە لـەوێ مانـەوە کـەرۆژ بویـەوە سـەربازەکانی بەعـس لەگەڕەکـی (پێنـج سـەد ماڵەکـە) دەسـتیان بەپشـکنین کـردو هەرلـەو گەڕەکـەش کۆتاییـان بەکارەکەیـان هێنـاو بەوشـێوەیەش قوتابخانـەی ئەڵـوەن بەوپێیـەی لەگەڕەکـی (سـیروان) ە نەکەوتەبـەر پشـکنینو پـاش ئـارام بونـەوەی شـار دوو پێشـمەرگەکەم هێنایـەوە مـاڵو پێـم وتـن هەرچـی پێویسـتیەکتان هەیـە بۆتـان جێبەجـێ دەکـەم، ئەوانیـش داوای بینینـی خوشـکەکانیان کـرد بـەڵام بـۆ ئـەوکات بەهـۆی بارودۆخەکـەوە زۆر زەحمـەت بـو بۆیـە وتـم ڕێگـەی ئەوکارەتـان پێنـادەم بـەڵام هەرچیەکتـان هەیـە لەنامەیەکـدا بینوسـن دەیگەیەنمـە دەسـتی کەسـوکارتان، پاشـان لـەدوای دڵنیابـون لەگـوزەرو کۆڵانـەکان یاوەریـم کـردن تاکەنـاری روبـاری سـیروانو خواحافیزیـم لێکـردن، بـەڵام بەداخـەوە دواترهەواڵـی شـەهید بونـی ئـەو دوو پێشـمەرگەیەم لەداسـتانێکی قارەمانێتیـدا پێگەیشـت.




قوتابخانەی (ئەڵوەن) ی بنەڕەتی ... فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان



ئەو کۆگایەی پێشمەرگەکانی تێدا حەشار درا ... فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان

## قایمقامەکانی قەزای کەلار ۱۹۷۰-۲۰۱۷

### مستەفا سەعید:

١ـ جلال بيلال ١٩٧٠ ـ ١٩٧١

٢ـ عبدالستار طاهر شريف ١٩٧٢ ـ ١٩٧٣

٣ـ محمد امين عبدالله احمد ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤

٤ـ صلاح الدين سعيد بابان ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥

٥ـ معاذ اسماعيل حقى خضر ١٩٧٥ ـ ١٩٧٦

٦ـ سعيد عزالدين حمودى ١٩٧٦ ـ ١٩٧٨

٧ـ محمد مجيد قادر ١٩٧٨ ـ ١٩٧٩

٨ـ هوشمەند مصطفى فتاح ١٩٧٩ ـ ١٩٨١

٩ـ عبدالجليل حسن حسين ١٩٨١ ـ ١٩٨٥

١٠ـ كامل حسن كەڵەمێرد ١٩٨٥ ـ ١٩٨٦

١١ـ ابراهيم كريم عزيز ١٩٨٧ ـ ١٩٨٨

١٢ـ بورهان الدين عبدالقادر ١٩٨٨ ـ ١٩٩٠

١٣ـ اسماعيل حقى تقى ١٩٩١ ـ ١٩٩٢ ليژنەی تەنسيق

١٤ـ سرتيپ محمد امين ١٩٩٢ ـ ١٩٩٤

١٥ـ عمران ياور قادر ١٩٩٥ ـ ١٩٩٦

١٦ـ حمه لطيف حسن حامد ١٩٩٧ ـ ١٩٩٩

١٧ـ عمر حفيد ١٩٩٩ ـ ٢٠٠٠

١٨ـ على شامار امين ٢٠٠١ ـ ٢٠٠٤

١٩ـ طارق رشيد على ٢٠٠٤ ـ ٢٠٠٥

٢٠ ـ جلال نورى عبدالقادر ٢٠٠٧/١٢/٩ ـ ٢٠١٥/٥/١٠

٢١ـ شهاب احمد محى الدين ٢٠١٥/٥/١٠ تا ئێستا

## ناوی قایمقامەکان بەوەکالەت:

١ـ محمود احمد محمود.

٢ـ رفعت على مشير.

٣ـ عمر ميرزا على.

٤ـ عبدالله انور عبدالله.

٥ـ عبدالله محمد سليمان.



عبدالستار طاهر شەریف



محمد أمين عبدالله


هۆشمەند مصطفی


محمد مجید قادر


سعید عزالدین حمودی


ابراهیم کریم عزیز


سەرتیپ محمد أمین جاف


کامل حەسەن کەڵەمێرد


عمر حەفید


حەمە لەتیف حەسەن حامد


عمران یاوەر قادر



عەلی شامار



طارق رشيد




جلال نوری عبدالقادر



شهاب احمد محي الدين



# شیکردنەوەو کاریگەرییە سروشتیەکان لەسەر دانیشتوانی شاری کەلار

ڕزگار حاجی حەمید

بـۆ دەرخسـتن و خستنەڕووی شێوەی ڕووی زەوی شـاری کـەلار پێویسـتە کـۆی فاکتـەرە سروشـتییەکان شـیکاری و شرۆڤـەی بۆبکـرێ ، ئەمـەش بەنەخشـەو خشـتە دەکرێـت , بەداخەوەتەرخانکردنـی چەنـد لاپەڕەیـەك بۆ ئـەم بابەتە هیـچ ئامانـج ناپێکـێ , چونکـە ئـەم هۆکارانـە پەیوەنـدی پتەویـان بەیەکـەوە هەیـە و بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ کارتێکردنیـان لـە سـەرکۆی کایەکانـی دابەشـبوون وزیادبوونـی دانیشـتوان و چالاکـی ئابـووری و کۆمەڵایەتـی و .. هتـد هەیـە، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش تەنها دەتوانیـن بەپێـی دەرفـەت ئـەم خاڵانەبخەینـە ڕوو :

## ١ـ شوێن و پێگەی شاری کەلار

شـوێن بریتییـە لـەو ڕووبـەرەی کـە شـاری لەسـەر بنیـات دەنرێـت واتـە سـنووری شـارەوانی شـار دەگرێتـەوە، بـەڵام (پێگـە) شـارو دەووروبـەری دەگرێتـەوە، پەیوەنـدی ئـەو پێگەیـە بەدەووروبـەرو گەشـەکردنی شـارەوە, شـاری کـەلار دەکەوێتـە نێـوان بازنـەی پانـی (٥٦، ٣٨، ٣٤، ٤٥، ٣٥، ٣٤) پلـەی باکـوور و نێـوان هێڵـی درێـژی (١٠، ١٦، ٤٥، ١٨، ٢١، ٤٥) پلـەی ڕۆژهـەڵات لەسـەر ڕووبەرێکـی تەخـت بونیـاد نـراوە کـە بەرزیەکـەی لـەڕووی دەریـاوە لەنێـوان (٢٠٠ ـ ٢٥٥) مەتردایـە , کـەلار وەك ناوەنـدی ئیـدارەی گەرمیـان دەکەوێتە دووری (٢٥٠کـم) لـە پایتەختـی هەرێمـی کوردسـتانەوە، هەروەهـا (١٦٠کـم) لەشـاری کەرکوك دوورەو (١٤٠کـم) لەشـاری سـلێمانیەوە دوورە ، هەروەهـا (١٨٠کـم) لەشـاری بەغـدادەوە دوورە، لەسـنووری ئێرانـەوە و لەمـەرزی پەروێزخـان (٣٥) کـم دوورە کـەلار دەکەوێتـە ناوچـە نیمچـە شـاخاوی هەرێمـی کوردسـتان لەناوچـەی بـان و گردەکانـی کەرکوك واتـە دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژهەڵاتـی هەرێمـی کوردسـتان لـە ڕووی کارگێریـەوە هاوسـنوورە لەگـەڵ سـێ قـەزای دیکـە، لـە باشـوورو ڕۆژئـاواوە هاوسـنوورە لەگـەڵ قـەزای کفـری و لـە ڕۆژهەڵاتـی قـەزای خانەقینەو، لـە باکـوورەوە قەزای دەربەندیخانـە, کـەلار پانتایـی و ڕووبەرێکـی فراوانـی هەیـە شـوێنەکەی لەبـارو گونجـاوە بـۆ زیاتـر گەشـەکردن و فراوانبـوون، لەسـەر ڕوبەرێکـی تەختایـی بنیـات نـراوە دەشـتێکی پـان و بەریـن دەگرێتـە خـۆ، ڕووبـاری سـیروان بەتەنیشـتیوە تێدەپـەڕێ کـە ئەمیـش کاریگـەری هەیـە لەسـەر شـارەکە ، یەکێکـە لـە قـەزا گرنگەکانـی هەرێمـی کوردسـتان دەکەوێتـە ناوچەیەکـی نیمچـە شـاخاوی و دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژهەڵاتـی هەرێمـەوە، شـاری کـەلار ناوچەیەکـی تەختایـی لـە ڕۆخـی ڕوبـاری سـیروان و لـە دامێنـی زنجیـرە چیاکانـی بەمـۆ و قەرەداغـەوە ، شـاخەکانی (مـازۆخ) بەردەسـوور شـاکەل ، لـە ناوچـەی بـان و گردەکانـی کەرکـوك لەگـەڵ قەزاکانـی ( کفـری و خانقیـن و دەربەندیخـان و جەلـەولا ) هـاو سنوورە ئـەم شـارە دەکەوێتـە سـەر هێڵـی ئۆتۆمبێلی (سـلێمانی ـ کـەلار ـ بەعقوبە ـ بەغـدا ـ کـەلار) لـە دیـوی ڕۆژئـاوا وە لـە ڕێگـەی کفریـەوە دە بەسـترێتەوە بـە کەرکوکـەوە، لـە ڕۆژهەڵاتـەوە لـە ڕێگـەی خاڵـی سـنووری پەروێزخانـەوە دەبەسـترێت بـە (قەسرشـیرین) ەوە, هـەر چەنـدە بەپێـی سـنووری ئۆتۆنۆمیـە کارتۆنیەکـە سـنوورەکانی ڕۆژئـاواوە تـا دێـی شـاکەل کەتەنهـا(٨) کـم دوورە لـە باشـوورە وە تـا دێـی شـێخ لەنگـەر (٩) کـم دوورە ئەوانـە سـەر بـە قـەزای کفریـن دواتریـش دوای دروسـتکردنی ناحیـەی کوڵەجـۆی حەمەجـان ، دوای گۆڕینـی ناوەکـەی بـۆ (خـان) دواجاریـش ئاوەسـپی کـە ئەمانـە زۆربـەی سـنووری ناحیـەی (تیلەکـۆ)ی کۆنـن ئەمیـش بـەم شـێوە خرایـە سـەر قـەزای کفـری ، لەگـەڵ ئەمانەشـدا سـنوورەکانی لەباکـوورە وە ناحیەکانـی شـێخ تەویـل ، پێبـاز کـە سـنوورێکی فـراوان لەخـۆ دەگرێـت، بنکەیەکـی سـتراتیژی و گرنگـی بـواری بازرگانـی و هەلـی کار کـردن بـوون هـەر بۆیـە تـا دێ ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ گەشـەیەکی زۆری بـە خۆیـەوە بینیـوە لـە شـارۆچکەکانی دەوروبـەرو لـەو دوایەشـدا لـە پارێزگاکانـی ناوەڕاسـت و خـوارووی عێراقـەوە ڕووی تێدەکـەن و

جگـە لـە جموجۆڵـی کاتـی تیـادا نیشـتە جـێ بـوون , ڕۆژانـە لـەم مـەرزەوە هـەزاران کەرەسـتە و بەرهەمـی جۆراو جـۆر لـە ئێرانـەوە دەهێنرێتـە دیـوی هەرێمـی کوردسـتانەوە لێـرەوە بـەرە و شـارەکانی تردەبرێـن ، پێگـەی کـەلار لـە ڕووی کشـتوکاڵەوە بـڕی (٢٩١١٩٧) دۆنـم کـە شـیاوە بـۆ کشـتوکاڵکردن (٢٨٥٠١٨) دەیمـی کاڵـە (٦١٧٩) دۆنمـی بـەراو (٥٦٩٥١٨) دۆنمـی بەردەڵانـە, ڕووبـەری کـەلار لـە سـاڵی١٩٧٧دا دەگاتـە ( ٣٦٤ )کـم٢ , ژمـارەی دانیشـتوان ٢٤٨٢٤چـڕی دانیشـتوان (٦٨ کەس/کـم٢) بەڕێـژەی (١٣,٤ ٪) لـە کـۆی گشـتی ڕووبـەری گشـتی پارێـزگای سـلێمانی پێـك دێنێـت , لەسـاڵی (١٩٨٧) دا ڕووبەرەکـەی دەگاتـە (٣٣٢)کـم٢, دانیشـتوانی ناوەنـدی قـەزای کـەلار ٨٢٠٠٤ کەسـە و چڕییەکـەی دەگاتـە (٢٤٧) کـەس , ڕووبەر/کـم٢, لـە (٢٠١٢) ەدا ژمـارەی دانیشـتوانەکەی دەکاتـە ١٨٤٩٧٣ کـەس ڕووبەریـش (١٧٥٠،٧٥)کم٢بەرێـژەی (١٤،٨٪) لـە کـۆی پارێـزگای سـلێمانی پێـك دێنـێ و (١٤٪) ڕوبـەری گشـتی لـە ئیـدارەی گەرمیـان، ئێسـتاش کـەلار ناوەنـدی ئیـدارەی گەرمیانـە


١. دعبدالله غفور ,کوردستان (دابەشی کارگێری و تریتوری١٩٢٧-١٩٩٩٧)چ٢,سلێمانی ,٢٠٠٣

٢. صبری الهیتی و صالح فلیح حسن ،جغرافیا المدن ،مدیریه دار کتب لگباعه والنشر،الموصل١٩٨٦

٣. رزگار حاجـی حەمید،کـەلار مێژویەکـی دێریـن و جوگرافیـای شـارێکی زیندوو،چاپخانـەی یاد،چاپـی یەکەم سـلێمانی،٢٠١٥


## خاك :

خـاك بریتیـە لـە چینێکـی تەنکـی هەڵوەشـاوە کـە تاوێرەکانـی بەردینـی داپۆشـیوە و ئەسـتوویەکەی لـە نێـوان چەنـد سـانتیمەترێك یـان چەنـد مترێـك دایيـە خـاك لـە ماوەی چەنـد سـاڵێکی کورتـدا دروسـت نابێـت بەڵکـو چەندیـن سـەدەی پێویسـتە ، بـۆ نمونـە دروسـتبونی ( ٥,٢ ) سـم لـە خـاك پێویسـتی بـە ( ٣٠٠ بـۆ ٩٠٠ ) سـاڵ هەیـە ، بـە پـێ ی ئـەو پۆلینـەی کـە زانـای هۆڵەنـدی ( بیورنـگ ) بـۆ خاکـی عیـراق لـە سـاڵی ( ١٩٦٠ ) ئەنجامـی داوە سـەیری نەخشـەی ژمـارە (١) بکـە، خاکـی ناوچـەی کـەلار لـە جـۆری خاکـی ( قاوەیـی ئەسـمەرە ) کـە خاکێکـی بـە پێتـە بـۆ کشـتووکاڵ ، بـە تایبەتـی کشـتوکاڵی دانەوێڵـە چونکـە ڕێـژەی مـادەی ئۆرگانـی تێـدا دەکاتـە نێـوان ( ١ – ٢٪ ) بـەڵام چینێـك لـە کلـس کۆبووەتـەوە لـە قووڵایـی ( ٢٥ – ٣٠ ) سـانتیمەتردا هەیـە ، لێکۆلینـەوە کـراوە لـە سـەر هەمـوو پێدوانـەکان لـە ڕوانگـەی مۆرفۆلۆجـی و فیزیایـی و کیمیاییـەوە ، ئەنجامـەکان کاریگـەری گـەورەی کـەش و هـەوای دەرخسـت لـە سـەر گەشـەکردنی خاکەکانـی ناوچـەی کـەلار و جـۆری ئاسـۆکان ، ئەسـتووری خاکەکـەی ، جـۆری ئاسـۆ نیشـانەکان ، کـە بریتـی يـە لـە ئاسـۆکانی سـەرەوە ( epipedons ) وە ئاسـۆکانی ژێـرەوە ( endo pedons ) هەروەهـا ئەنجامـەکان کاریگەریـی کـەش و هەوایـان دەرخسـت لـە سـەر بـڕو دا بەشـبوونی زۆرێـك لـە پێکهاتەکانـی خـاك ، خاکـی ناوچـەی کـەلار لـەم ڕێزبەندییـەی هەبـوو : لیتـە ، لم ، گڵ ، بەتێکـڕای ( ١,٢٣٥,٣٥٧,٣,٤٠٧ ( گـم / کگـم خـاك بـە دوای یەکـدا ..

هەروەهـا خـاك بـە یەكێك لە گرنگترین لە دەرامەتـە سروشـتیەكان دادەنرێت ، چونكـە ڕۆڵێكی كاریگـەری دەبینێ لـە بەدەسـت هێنانـی ئاسایشـی خـۆراك ، چونكـە پەیوەندییەكـی ڕاسـتەوخۆی بـە بەرهـەم هێنانـی كشـتوكاڵەوە هەیـە بـە ڕەگەزێكـی گرنـگ دانەنرێـت لـە پێدانـی هێـز و دابینكردنـی خـۆراك لـە سـەر ئـەو لێپرسراویەتیـەوە دێـت کـە وڵات دەیگرێتـە ئەسـتۆ ، بەرانبـەر گەلەكـەی لـە كاتـی شـەڕ و ئاشـتیدا ، بـۆ بەدەسـتهێنانی خاكـی فـراوان و بەرهەمهێـن لەگـەڵ بوونـی دەرامەتـێ ئـاو لـە گرنگتریـن سـامانی سروشـتین بـۆ دەوڵـەت ، چونكـە مـرۆڤ ڕاسـتەوخۆ یـان بـە ناڕاسـتەوخۆ پشـت دەبەسـتێت ، بـە جۆرێكـی خـۆراك جـا ڕووەكـی بێـت یـان ئاژەڵـی ، هەروەهـا خاكـی ناوچـەی لێكۆڵینـەوە دەكـــەوێتە نـاو پشـتێنەی ڕێـرەوی ناجێگیـر ( anstable shelf ) بـۆ ڕوون كردنـەوە بـە دیـاری كـراوی لـە پشـتێنەی شـوێنە كـەم نزمـەكان ( low foldedzone ) كـە ناوچـەی گـرد لـە خـۆ دەگرێـت ، هـەروەك دەكەوێتـە بەشـی باشـوری ڕۆژهەڵاتـی عیـراق كـە بـە ناوبانگـە بـە كەمـی ژمـارە و بەشـەكانی تـری هەرێـم درێـژ بوونەوەیەكـی تـری سـەرەكی لـە خـۆ دەگرێـت لـە باشـووری ڕۆژئـاوا و باشـووری ڕۆژ هـەڵات ئەمـەش بـە پشـتێنەی زاگـرۆس دەناسرێـت كـە لـە ژێـر كاریگەریـی جووڵـە ئالییـەكان كـە دەكاتـە ئـەو بـەری لـە سـەردەمی مایۆسـینی گـەڕاو بـۆ كانـی جیۆلۆجـی سـێەم .

بەپێی لێكۆڵینەوەی بیۆرینگ خاكی ناوچەی لێكۆڵینەیان لە قەزای كەلار بەم شێوەیە دیاری بكەین:

١- خاكی قەزای كەلار لەجۆری خاكی قاوەیی ئەسمەر دەدەنرێت ،كە خاكیكی زۆر بە پیتە ٠

٢- خاكی ئەم ناوچەیە كونیلە دارە ڕێكە بە ئاو دەدات بچێتە خوارەوە .

٣- ڕێژەی ماددەی ئۆرگانی گونجاوی تێدایە كە دەكاتە (١-٢٪).

٤- ئەستوری جیاوازە لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی تر .

٥- بونی چینێكی كلسی لە قوڵایی (٢٥- ٣٥)سم

٦- ڕێژەی شۆرەكاتی كەمە لەهەندێ ناوچەی بچوكدا نەبێت .

٧- ڕێژەی مەوادەكانی كانزایی زیاترە لە مەوادی ئۆرگانی .


١) علی حسن الشلش جغرافیا التربە،جامعە البصرە،بدون سنە،

٢) لیلـی قارەمان،كتێبـی جوگرافیـای هەرێمـی كوردسـتانی عیراق،چاپخانـەی وەزارەتـی پەروەردە،چ١،هەولێـر ١٩٩٨

٣) د.سالم نعمت،كێوماڵكردن و پۆلێنی هەندێ خاك لە كوردستان سلیمانی ساڵی ٢٠٠٦

٤) نەخشـان محمـد ڕۆسـتەم خـان، جیمورفولوجیـە منگقـە كلار، دراسـە تگلبیقیـە ، جامعـە سـلیمانیە، رسالە ماجسـتیر ، غیـر منشـورە فـی الجغرافیـە، ٢٠١٠

# ڕووەکی سروشتی

ڕووەکـی خۆڕسـك (سروشـتی) هـەروەك لەناوەکـەی دیـارە ئـەو ڕووەکانـە دەگرێتـەوە کـە لـە خـۆوە دەڕوێـن. دەشـتوانین بڵێـن بـاران هـۆکاری کارایـە لەدابـەش بوونـی ڕووەکـی خۆڕسـك لەهەرێمـی کوردسـتاندا، هەرچەنـدە ڕووەکـی خۆڕسـك بەگشـتی لـە کارلێکـی نێـوان ئاووهـەواو ڕووی زەوی هەرێمـدا هەیـە جیاوازییەکـی هاوتـاش لەڕووەکـی خۆڕسـکدا بـەدی دەکرێـت، ئـەم جیاوازییـەش لەنێـوان لێـرە و چیـاکان و گژوگیـای دەشـتەکاندا بـە ڕوونـی دیارە،سـەبارەت بـە ڕووەکـی سروشـتی ناوچـەی کـەلار دەکەوێتـە چوارچێـوەی گیـای سـتێپی شـێدارەوە کـە بارانـی سـاڵانەی لـە نێـوان (٣٠٠-٥٠٠ ملـم) دایـە ڕووەکە کورتـە باڵاو تەمـەن دارەکان وەکـو تەروو،کونار،شـەبەلاح، عاگوڵ، هەروەهـا ڕووەکـە وەرزییەکانـی وەکـو، جـۆ ، کێویلـە، کنگـر، تۆڵەکـە، بەیبـوون، گیـاوو درکـی جۆراوجـۆری لـێ دەڕوێت،ئەمـە جگـە لـەوەی لـە کەنـار ڕووبـاری سـیروان چەندیـن جـۆرەداری وەکـو (بـی، پەڵـك، تـوڕك و ژاڵە) دەڕوێـت، بوونـی دارو درەخـت و سـەوزایی لەچەندیـن ڕووەوە سـود بەشـارەکان دەگەیەنێـت، لەلایەکـەوە هـەوای پیـس و دووکەلـی کارگـە و ئۆتۆمبیلـەکان پـاك دەکاتەوە،لەلایەکـی تریشـەوە هاوسـەنگی پلـەی گەرمـی ڕادەگرێـت و لەهاوینـدا ئاووهـەوا فێنـك دەکاتـەوە. بەتایبەتـی بـۆ شـارێکی وەکـو کـەلار کـە هاوینەکـەی زۆرگەرمـە، بوونـی دارو سـەوزایی وەکـو بوونـی ئـاو و کارەبـا پێویسـتە چونکـە کارەبـا نـاو ماڵـەکان فێنـك دەکاتـەوە، بـەڵام شـار بەگشـتی گەرمـتر دەکات هەرچـی سـەوزاییە پلـەی گەرمـی هەمـوو شـارەکان فێنـك دەکاتەوە,لـەم ناوچەیەدائـەم ڕووەکانـە سـوودیان لێوەرگیـراوە، چ وەك سـەرچاوەییەکی ووزە چ وەك لـەوەڕگای ئاژەڵ،وێـڕای سـوود لێوەرگرتنییـان وەك سـەرچاوەیەکی خـۆراك لەلایـەن خەڵکـی ناوچەکەوە،ناوچـەی لێکۆڵینـەوە دەکەوێتـە هەرێمـی ئاووهـەوای نیمچـە وشـکی ڕاگوازراوی نێـوان ئاووهـەوای شـێداری باکـوور و ئاووهـەوای وشـکی بیابانـی لەباشـوورداو بەهـۆی جیـاوازی بـڕی بارانـی داباریـوەوە لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر جـۆرو چـڕی ڕووەکـی سروشـتی دەگۆڕێـت بەگشـتی تاوەکـو لـە باشـورەوە بـەرەو باکـوور هەڵکشـێن چـڕی و درێـژی ڕووەکەکـە و جۆرەکانـی زیـاد دەکات, گرنگتریـن ڕووەکەکانـی ئـەم ناوچەیـە بریتیـن لـە ڕووەکـی کورتـە باڵاو تەمـەن درێـژەکان وەك (تـەرو , عاگـوڵ , شـەپەلاح , کونـار) هەروەهـا ڕووەکـە وەرزییـە تەمـەن کورتـەکان کـە لەبەهارانـدا لـەم ناوچەیـەدا دەڕوێـن وەك (جۆکێویلەیـە , کنگـر , تۆڵەکـە , گوڵاڵـە سـورە , گوڵاڵـە زەردە , بەیبـوون , چاوبازەلەگـەڵ هەنـدێ دڕك و گیایـی بەهـارەی تـر جگـە لەمانـەش لـە کەنـاری ڕووبـاری سـیرواندا چەنـد جۆرێـك ڕووەکـی تایبەتـی دەڕوێـن گرنگترینیـان (داربـی , دارپەڵـك , دارژاڵـە , قامیـش و زەل) .

١- جەزا توفیق تالیب ،جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق،کۆمەڵێك مامۆستای زانکو،چ ٢،ساڵی ١٩٩٩

٢ –دەربازمحەمەد ، کەلار لە لادێوە بۆ شار،چاپخانەی چوارچرا،چ٢ ، سلیمانی ٢٠١٠



# گردە گۆزینە

## ئەحمەد محەمەد قادر

ناوی گردەگۆزینە

بەنـاوی گردێکـەوە ناونـراوە کـە تورەکـە ڕێـژە و گـۆزە و خشـتی سـوورەوە کـراوی تێدایـە (واتـا گـردێ گـۆزەی تیدابـێ).

## شوێنی گردەگۆزینە لە کۆندا

ئـەم گـردە بەنزیکـی ٥٠ مەتـر, دەکەوێتـە لای ڕۆژهەڵاتـی ڕاسـتە شـەقامی (کـەلار ـ جەلـەولا) وە, لای ڕۆژهەڵاتیەوە چەمـی سـیروانە و گەرمکیـك کـە سـەرچاوەکەی لەبنـی گردەکـەوە هەڵدەقوڵـێ ئاوێکـی پـاك و سـازگار و شـیرینی هەیـە , هەڵبژاردنـی ئـەم شـوێنەش بـۆ نیشـتەجێبون, پەیوەنـدی بـەم کانیـاوەوە هەبـووە (کـورد دەڵـێ : ئـاوو ئاوەدانـی) ئـەم کانیـاوە بێشـومار ماسـی تێدابـوو, خەڵکـی ناوچەکـە دوازدە مانگـە ڕاوەماسـییان لێدەکـرد, درێژییەکـەی نزیکـەی یـەك کیلۆمەتـر دەبـوو, دەڕژایـە ئـاوی سـیروانەوە, شـوێنێکی گەشـتیاری سروشـتی بـوو ئەمبـەرو ئەوبـەری داربـوو, نزیکـەی ٣ مەتـر قـوڵا بـوو, هێنـدە ڕۆشـن بـوو بنـی دیاربـوو, بەچـاوی خـۆم ماسـیم تێـدا بینیـوە نزیکـەی ٢٠ کیلـۆ دەبـوو, بەقـولاپ و تـۆڕی دەسـتی و سـەبەتە ڕاویـان تێـدا دەکرد..ئێسـتا بـە هـۆی زێـراب و دەرمانـی جـۆراو جـۆر بـۆ ڕاو پێدەچـێ بـە دەگمـەن ماسـی تێدامابـێ و کەڵکـی خواردنـەوەش بگـرێ ... گۆڕێـك لەسـەر ئـەم گردەیـە بەنـاوی (خولـە شـێت) خەڵکـی بـۆ شـیفای ژان و بـا سـەردانیان دەکـرد و نـان و میوەیـان لەسـەر دادەنـا. گازینـۆی بەگـزادەکان بـە دووری ٥٠ مەتـر دەکەوێتـە باکـوری ئـەم گـردەوە لـە حەفتاکانـەوە بونـی هەبـووە و ئێسـتاش مـاوە..

قـەڵای شـێروانەوە بـە نزیکـی (٢) کیلۆمەتـر دەکەوێتـە باکـوری ئـەم گـردەوە، پـردی گردەگۆزینـە کە لەسـەروبەندی شـەڕی (عێـراق ـ ئێـران) دروسـتکراوە لـە هەمـان شـوێنی پردێکـی کـۆن , کـە بـە (پاکۆپـری) نـاسراوە مێژوویەکـی نادیـاری هەیـە, شـێروانە بەبنکـورەوە دەبەسـتێ, واتـە ئەمبـەرو ئەوبـەری سـیروان, درێژییەکـەی نزیکـەی (٦٠٠) مەتـر دەبێـت, دەکەوێتـە باشـوری ڕۆژهەڵاتـی ئـەم گونـدەوە, لـەم ڕێکەوتـەدا حکومەتـی هەرێمـی کوردسـتان خەریکـی بەدووسـایدکردنیەتی.

کێ بەردی بناغەی ئەم گوندەی داناوە ؟

ئـەم گونـدە لەسـەر دەسـتی بنەماڵـەی خوالێخۆشـبوو (کوێخـا حەسـەن) کـە سـێ برابـوون, بـە ناوەکانـی (حەسـەن, عەبدولرەحـمان, محەمـەد) لـە عەشـیرەتی زەنگەنـە ئـاوەدان کراوەتـەوە , پێدەچـێ بنەماڵـەی شـێخ محەمـەدی شـێخ وەسـمان و بنەماڵـەی (سـید خەلیـل) یـش لەسـەروبەندی ئـەم ئاوەدانکردنـەوەدا بووبـن.

باپیـرەی مـن لـە ناوەڕاسـتی سـییەکان و لەتەمەنـی (٧٠) سـاڵیدا کۆچـی دوای کـردووە, شـوێنی لـە دایکبـوون و کۆچـی دوایـی لـەم گونـدە بـووە, سـەربە تیرەی زەنگەنـە بـووە, بۆیـە پێدەچـێ مێـژووی ئـەم گونـدە دەوروبـەری (١٥٠) سـاڵ پێـش ئێسـتا بـکات.

پاشـان بەهـۆی زۆربوونـی ژمـارەی خێزانەکانـەوەو بەرتەسـکی شـوێنەکە, گواسـتویانەتەوە ئەوبـەری (خـڕە شـێت)

شـوێنی ئێسـتا و شـارە دێـی گردەگۆزینـە, تـا ڕاگواسـتنی ناوچـەی بنکـورە بەهـۆی نسـکۆی سـاڵی (١٩٧٥) ی شۆڕشـەوە عەشـیرەتەکانی زەنگەنـە , سـەید ( سـەید پاساری خـۆر) , گەڵاڵـی لـەم گونـدە بـوون, نزیکـەی (٥٠ بـۆ ٦٠)ماڵێـك بـوون. ئێسـتا شـارەدێیەکی گەورەیـە و نـەك عەشـیرەت بەڵکـو نەتـەوەی جیاوازیشـی تێـدا نیشـتەجێیە.

*لـە کۆتایـی حەفتاکانـدا (بوژانـەوەی لادێـکان) هەبـوو , تیمێکـی وەرزشـی سـەردانی ئـەم گوندەیـان کـرد ,پـاش ڕاوێـژ , تەنها خانوویەکیـان لەسـەر شـەقامەکە دەستنیشـان کـرد و هەمـوو پێداویستیەکانی (تۆپـی پـێ) یـان هێناو دوو ڕاهێنـەر یەکێکیانـم بیـرە نـاوی (م.شـکر) بـوو, هەڵەنەبم لـە جەلـەولاوە دەهاتن, هەفتـەی دووجـار ڕاهێنانیان پـێ دەکردیـن تـا ئـەوکات ئێمـە لـە کـۆڵان و شـوێن خەرمانـەکان یاریـمان دەکـرد. ئـەو ژوورەی پێداویسـتی وەرزشـی تێـدا بـوو خوالێخۆشـبووان (محەمـەد شـەریف ـ حەمـە دێـز) و (نامـق عەلـی شـوان) پاسـەوانی بـوون. پاشـان هـەر لـەم چوارچێوەیـەدا دووبـواری دیکـە زیادکـران, بـواری پەلـەوەر و باخـداری , ئـەم بەشـەی بوژانـەوە لەلایـەن کشـتوکاڵی کـەلارەوە نێردرابـوون کەسـێك بـوو بەنـاوی (م.ئیبراهیـم), نزیکـەی (١٠٠) مریشـکی سـوری مەسـڵەحەیان هێنـا و بـە پێداویسـتی و خواردنـی پێشـکەوتووەوە لەماڵـی خوالێخۆشـبوو (حاجـی محەمـەد سـاڵەح) کـە موختـاری گونـد بـوو, ژوورێکیـان بـۆ گـرت و هەفتانـە سـەردانیان دەکـرد, بـۆ ئـەوەی ئـەم کەرتـە چالاك بکـەن و دانشـتوانی گونـد لـەم بـوارەوە هۆشـیار بکەنـەوە ,چونکـە ئـەوکات مریشـك لـە ژێـر دارو پـەردودا کاتێکـت دەزانـی بـە لانـێ جوجکـەوە دەهاتنـە دەر ,بەبـێ ئـەوەی خـاوەن مـاڵ ئـاگای لـێ بێ..ئێسـتا دەیـان کێڵگـەی بـە خێوکردنـی مریشـك لـە دەورو بـەری ئـەم گونـدەدا هـەن.

هەمـان ئـەم تیمـە سـەردانی خـاوەن باخەکانـی گوندەکەیـان دەکـرد و هۆشـیاری و دەواودەرمانـی باخدارییـان دەدانـێ, بیرمـەو خۆیشـم لـە ناشـتنی نەمامەکانـدا بەشـداربووم, نزیکـەی (١٠٠) نەمامـی پرتەقاڵیـان هێنـا لـە زەوییەکـی خوالێخۆشـبوو (جەبـار جـواد) لـە بـەری کارێـزە, لەسـەر بنەمایەکـی زانسـتی ناشـتیان, بـۆ ئـەوەی ئـەم کەرتـەش بـە شـێوازیکی زانسـتی پێشـبخەن و بەرهەمـەکان تەنهـا لـە سـنوری خێزانیـدا نەمێنێتـەوە، کـە ئێسـتا دەیـان بـاخ لـە دەورو بـەری ئـەم گونـدە هـەن.

لـەم سـێ کەرتـەدا (وەرزشـی, پەلـەوەر, باخـداری ...) تیپـە وەرزشـێکە و چەنـد کەسـێکی دیکـە بەشـدار بوویـن وایـان ڕاهێنایـن کـە ببینـە چاوسـاغ و وشـیاری بگەیەنیـن نزیکـەی دوو سـاڵ ئـەم بووژانەوەیـە بـەردەوام بـوو دواتر بەشـە وەرزشـێکەیان گواسـتەوە کـەلاری کـۆن و مریشـکەکانیان بـۆ خـاوەن ماڵەکـە و درەختـی پرتەقاڵەکانیـان بـۆ خـاوەن باخەکـە بـە جێهێشـت, بەنـدە بەشـدار بوویەکـی کارای ئـەو بووارانـە بـووم (ئـەم شـاهێدیە بـۆ مێـژوو دەدەم),..ئەمـە سـەرەتایەکی بـاش و بـە سـودی وشـیاری بـوو , کاریگـەری خـۆی لەسـەر دانشـتوانی گوندەکـە بەجێهیشـت تـا ئێسـتاش ئـەو بوارانـە برەویـان هەیـە، ئێسـتا (١٨) تیپـی وەرزشـی تۆپـی پـێ لـەم گونـدە هـەنو دەیـان کێڵگـەی پەلـەوەرو ئاژەڵـداری جۆراوجـۆرو, سـەدان پارچـە بـاخ و باخچـە, ژمـارەی دانیشـتوانی ئـەم گونـدە ئێسـتا (٣ هـەزار) مـاڵ و نزیکـەی (١٥ هـەزار) کـەس دەبـن.

کارێزەکانی ئەم گوندە

ناوچەکـە بـە گشـتی و ئـەم گونـدە بەتایبەتـی بـە پـێ دیاریـدەکان هـەزاران سـاڵ پێـش ئێسـتا ئـاوەدان بـووە و پـێ دەچـێ قـەڵای شـێروانە مەڵبەنـدی فەرمانڕەوایـی ئـەم ناوچەیـە بووبێت.

١ـ کارێزێـك کـە پـێ دەچـێ لـە نزیـك گەڕەگـی بەردەسـوورەوە (کونـا کونـا) ئاویـان لـە ڕووبـاری سـیروانەوە

(یادی ٤٧ ساڵەی بەقەزابوونی کەلار)

ترازاندبێ ,بۆ ناوچەکانی زەنگاباد , چونکە لەچەم و خرێکی نزیك گەڕەکی ئەندازیاران بەڕوونی دەردەکەوێ و حکومەتی هەرێم بە کاڵ و کرچی نۆژەنی کردۆتەوە, چونکە بە هۆی دەرکەوتن و لافاوەوە داڕوخابوو, هەر ئەم کارێزە کە بەژێر کەلاردا گوزەردەکا جارێکی دیکە لە خڕی پونگڵە (خڕە شێت کۆکە ڕەشە) کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای گردەگۆزینەوە بەدوری یەك کیلۆمەتر، جارێکیتر بە ڕونی و ئاشکرایی دەردەکەوێتەوە, لەبەردو قسڵا دروستکراوە, پانی و درێژی بەردەکان و شێوەی هەڵبەستن و ڕێرەوی ئەم کارێزەم لە گۆڤاری شێروانە بە وردترو بە وێنەوە پێشانداوەو نوسیوەتەوە، ئەوەی جێ سەرنجە ئەو بەردانەی کە پایەکانی پاکۆپریان لێ دروستکردوە ,لەگەڵا ئەو بەردە تاوێرانەی بۆ بەرگری لە ئاوی سیروان وسەلامەتی پاکۆپری بەکار هاتون , هەمان ئەم بەردانەن کە ئەم کارێزانەیان لێ دروستکردوون.

٢-کارێزێکی دیکە کە بە ژێر ماڵی (جەماڵ حسێن حەسەن) دا تێدەپەڕێ بە قوڵی نزیکەی (٥) مەتر کە ناوبراو لە کاتی هەڵکەندنی بیری ئاودا ڕێکەوتی ئەم کارێزەی کردو بەرێکەوت تەرمێکی لە کارێزەکەدا دۆزیەوە کە ڕاکشابوو ئێسکو پروسکەکەی وەك و خۆی و بێ شکان مابوو، ئەم وردەکاریەش لە کەناڵی (کوردسات یان خاك) وەختی خۆی بڵاوکرایەوە. دیارە ئەم کارێزەش لە سیروانەوە ترازاوە کە ڕێرەوو ئاڕاستەکەی لەگەڵ تەریبی سیرواندا نێوانیان نزیکەی (٢٥٠) مەتر دەبێ.

٣-کونا کەمتیارەکە, ئەم کارێزەش دەکەوێتە ناوەڕاستی گردەگۆزینە, لەنزیك ماڵی خوالێخۆشبوو (سەعید مامەخان) بە دووری چەند مەترێ, دەمی ئەم کارێزە نزیکەی (٥) مەتر لە سیروانەوە دورە ,ئێستا ئاستی سیروان نزیکەی (٧ بۆ ٨) مترلە ئاستی دەمی ئەم کارێزە نزمترە، بەم پێیە ئاوی سیروان سەر چاوەیەکی گرنگ بووە بۆ ئاوەدانی ناوچەکە.

سەوزەی گردەگۆزینە :

پاش ڕاپەڕین و گەمارۆی ئابوری سەر عێراق و کوردستان بە تایبەت , خەڵکی ناچار بوون بەشێ لە حەوشەکەیان بکەنە سەوزە , دواتر شارەزایی و پێداویستی خەڵك ئەم کارەی فروانترکرد (وەك دەڵێن پێویستی دایکی داهێنانە), بیری ئیرتیوازی (ناعور) لە زەوییە کشتوکاڵیەکاندا لێدەن و هەڵکەنن , ئیتر هەموو جۆرە سەوزەیەکیان لێ دەوەشاند , تاوای لێهات لە ڕووی چۆنیەتی و چەندایەتیەوە سەوزەی گردەگۆزینە ناوبانگی دەرکردو دەگەشتە زۆربەی شارو پارێزگاکانی دەوروبەر, تەنانەت سەوزەکانی شوێنەکانی دیکەش هەر هاواریان لێ دەکرد سەوزەی گردەگۆزینە , چونکە بە ئاوی پاك و لە زەوی بەپیتدا بەرهەم دەهات، بەجۆرێك بووە سەر چاوەی بژێوی و گوزەرانی هەزاران خێزان , بە ئێستاشەوە.

قۆناغەکانی فراوان بوونی گردەگۆزینە :

١-بەهۆی ڕاگواستنی گوندەکانی قەزای خانەقین , پاش تیاچونی شۆڕشی ١٩٧٥ .

٢-دوای پرۆسەی ئەنفال و ڕوخاندن و چۆڵکردنی لادێکان.

٣-دوای ڕاپەرینی بەهاری ١٩٩١ و گەمارۆی ئابوری سەر عێراق , چونکە ئەم گوندە زەوی باش و بەراوی هەبوو ,خەڵکی بۆ ژیان ڕوویان تێدەکرد.

٤-دوای ڕزگار کردنـی عێـراق لـە سـەر دەسـتی هاوپەیمانـان و پاشـتر هاتنـی تیـرۆر و دواتـر داعـش. ئەمانـە بوونـە هـۆی کۆچـی خەڵکـی ناوەڕاسـت و ناوچـە مەترسـی لەسـەرەکان بـۆ ئـەم سـنووره بەتایبـەت گونـدی گردەگۆزینـە, چونکـە هەلیـکارو ژیانـی تـا ئاسـتێك تێدابـوو, لـە ڕووی ئیداریشـەوە بـە بـەراورد لەگـەڵ شـارەکان گرفتـی ئیـداری کەمتربـوو بـۆ ئـاوارەکان.

جوگرافیای گردەگۆزینە :

- دەکەوێتە سەرشەقامی کەلار ـ جەلەولا .

- لە ڕۆژهەڵاتیەوە ئاوی سیروان بە تەنیشتیدا دەڕوا.

- لـە ڕۆژئاوایـەوە زنجیرەیـە تەپۆڵکـە کەبـە (جەوەڵـە بچـوك) نـاسراوەو و گونـدی (دێبنـە) کـە نزیکـەی (٣) کیلۆمەتـر لێـوەی دووره..

-بەدوری (٢) کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری قەڵای شێروانەوە.

-لـە باشوریشـەوە، گونـدی گێـژەکان (بـەزۆری عـەرەب نشـینن و ڕەنگـە (٥٠ بـۆ ٦٠)ماڵێـك بـن.. ئـەم گونـدە (گردەگۆزینـە) نزیکـەی (٢) کیلۆمەتـر لـە سـنووری پارێـزگای دیالـەوە دووره, لـە ڕووی ئیدارییـەوە وەك گەڕەکێـك لـە گەڕەکەکانـی قـەزای کـەلار مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکرێـت, گەرچـی شـارەوانی تایبـەت و بنکـەی تەندروسـتی و بنکـەی پۆلیسـی تێدایـە.



دیمەنێك لە گردەگۆزینە

# وتاری یەکەمین فیستیڤاڵی ٤٦ هەمینساڵیادی بەقەزابوونی کەلار

ئەگەرچی دڵی سەردەمی لاویم
بڵێسەی بەرزی کوردستانم بوو

بازووی بەهێزو چنگی خوێناویم
نیشانەی زەبری تێکۆشانم بوو

بەڵام پیرییەکەم سوتێنەرترە
چونکە نەك هەر دڵ بوونم ئاگرە

بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە

ئامادەبوانی خۆشەویست، خوشك و برایانی بەڕێز

بەناوی لیژنەی ئامادەکاری یەکەم فیستیڤاڵی بەقەزابوونی شاری کەلار فرە فرە بەخێربێن ...

ئامادەبوانی بەڕێز

٤٦ سـاڵ پێـش ئێسـتا لەوەهـا ڕۆژێکـدا ئـەم شـارە لـە دووسێ گونـدی دوورە دەسـتەوە، وەکـو (کـەلاری کۆن‌و بنگـردو حەمـەی کەریـم) زیاتـر هیچـی تـر نەبـوو، بـەڵام لەنـاکاو لەلایـەن دەسـەڵاتدارانی ئەوکاتـەی عێراقـەوە، بەبڕیارێکـی فەرمـی بەنـووسراوی ژمـارە (٣٧) مـادەی (٥) لـە یاسـای پارێـزگاکان ژمـارە (١٥٩) سـاڵی (١٩٦٩) کـرا بـە قەزایەکـی سـەربەخۆ و ناویشـی لێـنرا قـەزای کـەلار.

دەبێ بپرسـین هـۆکاری پـێ بـوو کـە کـەلار بکرێـت بەقـەزا و شـارێك لـەم ناوەنـدەدا قـوت بکرێتـەوە، دەبێـت ئـەوەش لەبەرچـاو بگریـن و بزانیـن ئـەم گونـدە دوورە دەسـتانە بـۆ کـران بـە قـەزاو لەمەبەسـت و نیازەکانـی ئـەو بڕیـارە بکۆڵینـەوە.

لـەدوای ٤٦ سـاڵ ئێسـتا کـەلار شـارێکە، خاوەنـی پێگـەو جوگرافیایەکـی زینـدوو، ژمـارەی دانیشـتوانەکەی لـە دووسـەد هـەزار کـەس زیاتـرەو مێژوویەکـی پـڕ لـە ڕووداوی جۆراوجـۆری سـاڵانی ڕابـردووە، بەپێویسـتمان زانـی لەوەهـا ڕۆژێکـدا لـە فیسـتیڤاڵێکی تایبەتـدا ئـەم ڕۆژە بکەیـن بەبـەردی بناغـەی ڕۆژی کـەلار.

سـاڵانی شەسـتەکانی سـەدەی ڕابـردوو، شۆڕشـی ئەیلولـی خەڵکـی باشـوری کوردسـتان‌و ڕووداوە جەمـاوەری‌و بیـری نەتەوایەتـی‌و نیشـتمانی لەنـاو دڵـی زۆربـەی خەڵکیـداو لای دۆسـت و دوژمنانـی کـورد بـوو بـوو بەڕاسـتییەکی چەسـپاوو گشـتگیر، ڕژێمـی لەناوچـووی بەعسـی عێراقـی، تـازە هاتبوونـە سـەر دەسـەڵات‌و لەچەنـد مانۆڕێکـی گـەورەی سـەربازیدا، بەرانبـەر بـە شـۆڕش و هێـزی پێشـمەرگەو خەڵکـی کوردسـتاندا شکسـتی گەورەیـان خـوارد، هەربۆیـە کەوتنـە بیرکردنـەوە لـە گەمـەی سیاسـی‌و فریودانـی جەمـاوەری دڵسـۆزی کوردسـتان.

لەیەکـەم کاردانەوەیانـدا لـە ١٩٧٠/٢/٢٨ ی سـەدەی ڕابـردوو دەرکردنـی بڕیـاری بەقەزاکردنـی گونـدی کـەلار بـوو، بەنیـازی گڵاویـان سـڕینەوەی شـارەکانی کفـری‌و خانەقـی بەهەمـوو گونـدو ناحیەکانییـەوە، لـە تۆبۆگرافیـای هەرێمـی باشـوری کوردسـتان‌و لەسـەر نەخشـەی کوردسـتان نەمێنـێ‌و وەکـو ناوچەیەکـی عـەرەب نشـین بلکێـن بەعێراقـی عەرەبییـەوە.

دوای ئـەو بڕیارەیـان لـە ڕۆژی ١٩٧٠/٣/١١ واتـە دوای ١١ ڕۆژ بەبڕیارێکـی فەرمـی ئەنجومەنـی سـەرکردایەتی بەعسـی عێـراق، دانـی نـا بەمافـی گەلـی باشـوری کوردسـتاندا، کـە بەبەیانـی یـازدەی ئـازار نـاسراوە، مـاوەی چوارسـاڵ گفتوگۆو دانوسـان لەلایـەن سـەرکردایەتی کـوردو ڕژێمـی فاشسـتی عێراقەوە درێـژەی کێشـا، لەوماوەیەدا دەسـەڵاتدارانی عێـراق سـەدان گەمـەی سیاسـیو تیـرۆرو تۆقانـدنو نانبڕیـنو دەربەدەرکـردنو هەڵخەڵەتاندنـی کەسانی بەرژەوەندخـواز، دژی گەلـی کـوردو شۆڕشـەکەی ئەنجامـدا، تـاکار گەیشـتە مانـۆڕی سیاسـی نێودەوڵەتـی دژی ئـەم گەلـە سـتەمدیدەیە، دوای سـاڵێکی تـری پـڕ خەبـاتو شۆڕشـی چەکـداریو قوربانـی سـەرەنجام بەنێوەندگیـری ئەمریـکا لەمانگـی ئـازاری ١٩٧٥ لـە کۆنگـرەی ئۆپێکـدا کـە نـاسراوە بـە (پەیمانـی جەزائیـر) لەنێـوان سـەدام حسـێن کـە ئـەو سـەردەمە جێگـری سـەرۆك کۆمـاری عێـراق بـوو، لەگـەڵ محەمـەد ڕەزا شـای پەهلـەوی ئێـرانو هـەواری بۆمیدیـان سـەرۆکی ئەوکاتـەی جەزائیـر، شۆڕشـی کوردسـتان تووشـی داڕمـانو نسـکۆ هـات.

خەڵکـی شۆڕشـگێڕی نـاو شـۆڕش ناچارکـران نەگەڕێنـەوە بـۆ شـارەکانی کفـریو خانەقیـن، بەتایبەتـی خەڵکـی ناحیـەو گوندەکانـی ناوچـەی خانەقـیو ئەوناوچانـەی کـە ئێسـتاش پێـی دەڵێـن «ناوچـە کێشـە لەسـەرەکان» بەهـەزاران خێزانیشـیان دوورخرانـەوە بـۆ ناوەڕاسـتو باشـوری عێـراق کـە بەشـداری شۆڕشـیان کردبـوو.

سـاڵی ١٩٧٦ کاتـێ بڵێسـەی شۆڕشـی نوێـی باشـوری کوردسـتان هەڵگیرسـا، لەژێـر فشـاری ڕێکخسـتنەکانی شـۆڕشو هێـزی پێشـمەرگەدا، ڕژێـم ناچاربـوو ڕێگـە بەخەڵکـە دوورخـراوەکان بـدات بگەڕێنـەوە بـۆ شـارەکانی بەنـاو ئۆتۆنۆمـی کوردسـتان، کـە قـەزای کـەلار بەشـێك بـوو لـەو سـنوورە جوگرافیایـەی ناوچـەی ئۆتۆنۆمـی، هەڵبەتـە خەڵکـی ناوچـەی گەرمیـانو گەرمەسـێر هاتنـە کـەلار کـە نزیکتریـن شـوێن بـوو لەناوچەکانـی خۆیانـەوە.

هاتنـەوەی ئـەو ژمـارە زۆرەی خەڵکەکـە کـە قـەزای کـەلاری کـرد بەشـارێکی گـەورەو پـڕ جمووجوڵـی سیاسـیو کۆمەڵایەتـیو ئابـوری، لەبیرمـان نەچێـت ئـەو خەڵکـەی لـەم شـارەدا نیشـتەجێکران زیاتـر خەڵکانێکـی هەڵقـوڵاوی نـاو شـۆڕشو کوردایەتـی بـوون، هەربۆیـە ژمارەیەکـی زۆری خەڵکـی، جارێکیـتر بەهیـوای خۆڕێکخسـتنەوەی ناومـاڵی کـورد پەیوەندییـان کـردەوە بەهێـزی پێشـمەرگەو ڕێکخسـتنەکانەوە، ئـەم شـارە بەپێچەوانـەی بیـری شـۆڤێنی بەعسییەکان بـوو بەسـەنگەری پێشـەوەی شـۆڕشو کوردایەتـیو پەلوپـۆی هاویشـتە ناوچـە داگیرکـراوو زەوتکراوەکانیـان، لەلایـەك دەسـتی پێشـمەرگە دەگەیشـتە ئەوپـەڕی سـنووری خـوارووی کوردسـتان واتـە بەرزاییەکانـی حەمریـنو ڕێکخسـتنەکانی دەگەیشـتنە تـاك بەتاکـی ماڵـە کوردەکانـی بەغـداو ناوەڕاسـتو خـوارووی عێراقیـش، بینیـمان ئـەم شـارە بـوو بەچقڵـی چـاوی بەعـسو سوپاکەشـی.

گەرچـی بەعسـییەکان درێغییـان نەدەکـرد لەکوشـتنو ڕاودوونانـی دڵسـۆزانی کوردایەتـی، بـەڵام کەلارییـەکان سـووربوون لەسـەر دروشـمی خەبـاتو گیـان بـازیو ڕابـوون، تەنانـەت بەبەرچـاوی ئەمانـەوە دەیـان هـەزار، خەڵکـی سـڤیلی ناوچـەی گەرمیانیـان ئەنفالکـرد، ئـەوە بـوو بەهـۆی زیاتـر جۆشـدانی هەسـتی کوردایەتـیو سـووربوون لەسـەر داوا ڕەواکانیـان.

سـاڵی ١٩٩١ لەڕاپەڕینـە جەماوەرییەکـەو هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتاندا، ئـەم شـارە بـوو بەبورکانـی ئاگـرو بەرخـودان، شـوێن پێـی داگیرکەرانـی هەتاهەتایـە لەناوچەکـەدا سـڕییەوە، بـۆ چەندیـن سـاڵیش سـەنگەری پێشـەوەی ناوچـە ئازادکـراوەکان بـوو، تـا پرۆسـەی ئازادکردنـی تـەواوی عێراقـی.

ئەوەتـا بەبەرچـاوی هەمووماننـەوە کـوڕە گیانبازەکانـی ئـەم شـارە بەخەبـاتو بەقوربانیدانیـان پێشـەنگی

شــەهیدبوونیان لەهەمــوو جەنگەکانــدا دژی داعــشو داگیرکەرانــی کوردســتان، نــاوی کەلاریــان گەیاندووەتــە لوتکــەی هەڵوێســتی مرۆڤایەتــیو پێکەوەژیــان.

ســەرەڕای ئەمانــەش کــەلار بــوو بەشــوێنێکی ئــارامو نیشــتەجێبوونی هــەزاران خەڵکــی ئــاوارەو لێقەومــاوی ناوچەکانــی تــری کوردســتانو عێــراق، تــاوای لێهــات کــەلار لەگوندێکــی ســادەو بچکۆلــەوە ببێــت بەشــارێکی ئــاوا ئــاوەدانو بنکــەی بازرگانــیو بووژاندنــەوەی ناوچەکانــی تــری کوردســتان، ئێســتا شــاری کــەلار لەپێگــەو نەخشــەی جیهانیشــدا ناوێکــی دیــارە، ململانێــی پارێزگاکانــی تریــش دەکات، خاوەنــی دەروازەی بازرگانــی نێــوان عێــراقو دەوڵەتــی ئێرانــە، جگــە لــەوەش ئێســتا ئەم شــارە بــووە بەئیدارەیەکــی ســەربەخۆو بەڕێوەبــەری هەمــوو بەڕێوەبەرە گشــتییەکانی دەڤــەری گەرمیــان.

وەکــو دروشــمی لەوەپێشــمان دەبێــت ســووربین لەســەر ئــەوەی کــە کــەلار بکرێــت بەناوەنــدی پارێــزگای گەرمیــانو ئەویــش مافێکــی ڕەوای خەڵکەکەیەتی.

ئامادەبوانی بەڕێز

گەرچــی ئەمســاڵ بەهــۆی دارمانــی ئابــوریو نەبوونــی داراییــەوە، نەمانتوانــی بەکامــی دڵ، چالاکییەکانمــان گــەورەو فــراوان بکەیــن، نەمانتوانــی شــارەکەمان بڕازێنینــەوە، ئەمســاڵ بەخۆبەخشــیو هەوڵــی دڵســۆزی ڕۆشــنبیرانو هونەرمەنــدانو خەڵکــە دڵســۆزەکەی هەرئەوەندەمــان پێکــرا، ویســتمان ئــەوە بســەلمێنین کــە کەلارییــەکان بەهەمووەمانــەوە، وەکــو چــۆن پێشــتر دەســتمان هەبــووە لەجوانترکردنــی شــارەکەمان، ئــاواش ئــەم ڕۆژە ٢/٢٨ هەمــوو ســاڵی بکەیــن بەنەریتــی ســاڵانەی شــاری کــەلار...

لەگەڵ ڕێزی بێ پایانی

لیژنەی ئامادەکاری فیستیڤاڵ

سوپاس بۆ ئامادەبوونتان سوپاس بۆ گوێ گرتنتان

٢٠١٦/٢/٢٨

# چالاکییەکانی یەکەمین فیستیڤاڵی (٤٦) هەمین ساڵەی بەقەزابوونی کەلار

## دلێر عەبدولڕەحمان

بەدروشـمی (کـەلار ناوەنـدی بووژانـەوەو گەشـەکردنی گەرمیـان) و بەچاودێـری شـەهاب ئەحمـەد محـی الدیـن، قایمقامـی قـەزای کـەلارو ئامادەبوونـی سەرپەرشـتیاری ئیـدارەی گەرمیـانو بەڕێوەبـەری ژمارەیـەك لـە بەڕێوەبەرایەتـیو فەرمانگـەو دامـودەزگا حکوومییەکانـی گەرمیـانو کـەلار، ڕۆژی ٢٠١٦/٢/٢٨، لەهۆڵـی ناوەنـدی وەرزشو لاوانـی کـەلار چالاکییەکانـی یەکەمیـن فیسـتیڤاڵی ٤٦ هەمیـن سـاڵەی یـادی بەقەزابوونـی کـەلار دەسـتپێکرد.

سـەرەتای مەراسـیمەکانی یەکەمیـن فیسـتیڤاڵی ٤٦ هەمیـن سـاڵەی بەقـەزای بوونـی کـەلار بـە کردنـەوەی پێشـنگایەکی فۆتۆگرافـی بەنـاوی (کـەلا لەچـاوی وێنەکانـەوە) دەسـتپێکرد کەلەلایـەن (دیـار ڕەشـید و دلێـر عەبدولڕەحـمان) ەوە ئامادەکرابـوو وەکـو ئاماژەیـەك بـۆ ٤٦ هەمیـن سـاڵەی بەقەزابوونـی شـارەکە ٤٦ فۆتـۆی سـەردەمە جیاوازەکانـی شـارەکەی لەخۆگرتبـوو لەهەمـوو بوارەکانـی کۆمەڵایەتـیو سیاسـیو پەروەردەیـیو وەرزشـیو هونـەریو خزمەتگـوزاری.

دواتـر لـە هۆڵـی وەرزشو لاوانـی کـەلار سـاڵەح هـەلاج وتـاری لیژنـەی ئامـادەکاری یەکەمیـن فیسـتیڤاڵی ٤٦ هەمیـن سـاڵەی بەقەزابوونـی کـەلاری خوێنـدەوەو تێیـدا هاتبـوو «٤٦ سـاڵ پێـش ئێسـتا لەوەهـا ڕۆژێکـدا ئـەم شـارە لـە دووسـێ گونـدی دوورە دەسـتەوە، وەکـو (کـەلاری کـۆنو بنگـردو حەمـەی کەریـم) زیاتـر هیچـی تـر نەبـوو، بـەڵام لەنـاکاو لەلایـەن دەسـەڵاتدارانی ئەوکاتـەی عێراقـەوە، بەبڕیارێکـی فەرمـی بەنـووسراوی ژمـارە (٣٧) مـادەی (٥) لـە یاسـای پارێـزگاکان ژمـارە (١٥٩) سـاڵی (١٩٦٩) کـرا بـە قەزایەکـی سـەربەخۆ و ناویشـی لێـنرا قـەزای کـەلار».

لەبەشـێکی تـری وتارەکـەدا ئامـاژە بەوەدرابـوو کـە « سـاڵی ١٩٩١ لەڕاپەڕینـە جەماوەرییەکـەو هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتاندا، ئـەم شـارە بـوو بەبورکانـی ئاگـرو بەرخـودان، شـوێن پێـی داگیرکەرانـی هەتاهەتایـە لەناوچەکـەدا سـڕییەوە، بـۆ چەندیـن سـاڵیش سـەنگەری پێشـەوەی ناوچـە ئازادکـراوەکان بـوو، تـا پرۆسـەی ئازادکردنـی تـەواوی عێـراق، ئەوەتـا بەبەرچـاوی هەموومانـەوە کـوڕە گیانبازەکانـی ئـەم شـارە بەخەبـاتو بەقوربانیدانیـان پێشـەنگی شـەهیدبوونیان لەهەمـوو جەنگەکانـدا دژی داعـشو داگیرکەرانـی کوردسـتان، نـاوی کەلاریـان گەیاندووەتـە لوتکـەی هەڵوێسـتی مرۆڤایەتـیو پێکەوەژیـان».

لـە وتارەکـەدا جەخـت لەوەکرابـووەوە «گەرچی ئەمسـاڵ بەهـۆی دارمانی ئابـوریو نەبوونـی داراییـەوە، نەمانتوانی بەکامـی دڵ، چالاکییەکانمـان گـەورەو فـراوان بکەیـن، نەمانتوانـی شـارەکەمان بڕازێنینـەوە، ئەمسـاڵ بەخۆبەخشـیو هەوڵـی دڵسـۆزی ڕۆشـنبیرانو هونەرمەنـدانو خەڵکـە دڵسـۆزەکەی هەرئەوەندەمـان پێکـرا، ویسـتمان ئـەوە بسـەلمێنین کـە کەلارییـەکان بەهەموومانـەوە، وەکـو چـۆن پێشـتر دەسـتمان هەبـووە لەجوانترکردنـی شـارەکەمان، ئـاواش ئـەم ڕۆژە ٢/٢٨ هەمـوو سـاڵی بکەیـن بەنەریتـی سـاڵانەی شـاری کـەلار».

دواتریـش قایمقامـی قـەزای کـەلار وتارێکـی پێشکەشـکردو پاشـانیش لەلایـەن مامۆسـتا ئەحمـەد بـاوەڕ سـیمینارێك لەسـەر مێـژووی کـەلار بەڕێوەچـوو تێیـدا ئامـاژە بەدروسـتبوونی شـاری کـەلارو مێـژووی بـوون بـە ناحیـەو

بەقەزابوونـی شـارەکە درا لەگـەڵ ئامـاژەدان بەنـاوی ژمارەیـەك کەسـایەتی شـارەکە.

دواتریـش لەلایـەن تیپـی مۆسـیقای سـەنتەری چالاکـی گەنجانـی کـەلار ژمارەیـەم بەرهەمـی هونـەری پێشکەشـی ئامادەبـووان کـرا.

پاشـنیوەڕۆی هەمـان ڕۆژ لەسـەر قـەڵای شـێروانە بەئامادەبوونـی ژمارەیـەك بەرپرسـی حزبـیو حکوومـی پـەردە لەسـەر ماکێتـی قـەڵای شـێروانە لادرا کەلەلایـەن هونەرمەنـد (پشـکۆ محەمـەد ڕۆسـتەم) ەوە ئامادەکرابـوو، دواتریـش دانیشـتنێکی ئەدەبـی لەهەمـان شـوێندا سـازکرا.

پاشـنیوەڕۆی هەمـان ڕۆژ لەیاریـگای ناحیـەی ڕزگاری، یاریەکـی دۆسـتانە لەنێـوان تیپـی ڕۆژنامەنووسـانی بیـنراوی گەرمیـانو بەڕێوەبـەری فەرمانگەکانـی سـنووری گەرمیـان ئەنجامـدراو یارییەکـە بـە (٥) گـۆڵ بەرامبـەر بـە (٣) لەبەرژەوەنـدی تیپـی بەڕێوەبـەری فەرمانگەکانـی سنوورەکە کۆتاییهـاتو لەکۆتایـی یارییەکەشـدا خـەڵات بەسـەر یاریزانانـدا دابەشـکرا.

شـەوی ٢٠١٦/٢/٢٨ لەکۆتـا چالاکـی ٤٦ هەمیـن سـاڵەی بەقەزابوونـی کـەلاردا، شـەوەدیدارێکی هونـەری لـە مۆزەخانـەی (سـاڵەحی کەلەپـور) سـازدرا.






















# فۆتۆستۆری یەکەمین فیستیڤاڵی ٤٦ ساڵەی بەقەزابوونی کەلار

فۆتۆ: دلێر عەبدولڕەحمان

















# فۆتۆستۆری کەلار لە چاوی وێنەکانەوە

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: دیار رەشید


پشتیوانی جەماوەری کەلار لەمانگرتوانی ساڵی ١٩٩٢... ئەرشیف: ئازاد عەلی


ئاهەنگی نەورۆز ساڵی هەفتاکان


تیپی هەڵبژاردەی کەلار ساڵی ١٩٨١...


پشتیوانی جەماوەری کەلار لەمانگرتوانی ساڵی ١٩٩٢... ئەرشیف: ئازاد عەلی


فیستیڤاڵی ساڵانەی چالاکی قوتابخانەکانی کەلار ١٩٩٣


تیپی کۆنفۆی کەلار ... ئەرشیف: وریا عەلی هاجەر


فلکەی ماسیەکە ٢٠٠٧... فۆتۆ بیلال سعید


ئاهەنگێکی جەماوەری لەسەر قەڵای شێروانە ١٩٩٦



مامۆستایانی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی



قەڵای شێروانە پێش نۆژەنکردنەوە



هەندێ لە ڕۆژنامەکانی کەلار ... فۆتۆ: دلێر عەبدولرەحمان



مامۆستایانی یەکەم قوتابخانەی ناوەندی لەکەلار ١٩٧١... ئەرشیف: حەسەن جاف



یەکەمین فیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان ساڵی١٩٩٨ ئەرشیف:م.جەمال سعید



یەکەمین فیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان ساڵی١٩٩٨ ئەرشیف:م.جەمال سعید



تیپی مۆسیقاو شانۆی کەلار ... ئاهەنگی نەورۆز ١٩٨٩.. ئەرشیف:احمد میکایل



قەڵای شێروانە پێش نۆژەنکردنەوە